ستیفن برۆکفیڵد
پۆڵ ئە. لیڤن

وەرگێڕانی
ئیبراهیم خ. ئەحمەد



# بۆ نەوەکانتانی بگێڕنەوە

دەربارەی ئەو هۆلۆکۆستەیە کە
لە ئەورووپای ١٩٣٣-١٩٤٥ دا ڕوویداوە

# بۆ نەوەکانتانی بگێڕنەوە..

دەربارەی ئەو هۆلۆکۆستەیە کە
لە ئەوروپای ١٩٣٣ - ١٩٤٥ دا ڕووی داوە

ستیڤن بروکفیلد
و
پۆل ئە. لیڤن

وەرگێڕانی: ئیبراهیم خ. ئەحمەد

سلێمانی ٢٠٠٢

❖ ناوی کتێب: بۆ نەوەکانتانی بگێڕنەوە..
❖ بابەت: مێژوویی
❖ نووسینی: ستیڤن بروکفیلد و پۆل ئە. لیڤن
❖ وەرگێڕانی: ئیبراهیم خ. ئەحمەد
❖ مۆنتاژی کۆمپیوتەری و کاری هونەری: تاڤگە فائق
❖ پیاچوونەوە و هەڵەچنی چاپ: مهاباد رەحیم
❖ تیراژ: ٥٥٠ دانە
❖ ژمارەی سپاردن: ٣٩٩ی ٢٠٠١
❖ کۆمپیوتەر و ئۆفسێتی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم



زنجیرە کتێبی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم (١٦٥)

پێش دوو هەفتە بە کارێکی تایبەت چوومە فەرمانگەی پەنابەران لە شاری ستۆکهۆلم، ماوەی چارەکە سەعاتێك پێش مەوعدەکەی خۆم گەیشتمە ئەوێ بۆیە لە پرسگەکە دانیشتم و چاوەڕێ بووم تا ئەو چارەکە سەعاتە بەسەردەچێت.

لەزۆربەی هەرە زۆری فەرمانگە و خەستەخانە و شوێنە گشتییەکانی ئەم شارەدا لە پرسگەکان، گۆڤارو ڕۆژنامە دانراون تا ئەو کەسانەی بۆ کارێك ڕێیان دەکەوێتە ئەو شوێنانە، ماوەی چاوەڕوانکردنەکەیان بە خوێندنەوەی ڕۆژنامەیەك یان گۆڤارێکەوە بەسەر بەن، منیش تەماشایەکی ڕەفەکانی پرسگەکەم کرد، کتێبێکی بەرگ ڕەش کە وێنەی چەند ژن و منالێکی لە شێوەی ئاوارەدا لەسەربوو و لەسەر کتێبەکە نوسرابوو (بۆ نەوەکانتانی بگێڕنەوە..) وێنەکەو ئەو نوسراوە سەرنجیان ڕاکێشام، سەیرێکی کتێبەکەم کرد بینیم کە بە زۆربەی زمانەکان (ئینگلیزی و ئەڵمانی، عەرەبی و فارسی، یوغۆسلاڤی و ...هتد چەند زمانێکی تریش هەبوو، بەڵام بەزمانی کوردی تێدا نەبوو، لەخەیاڵی خۆمدا وتم ڕەنگە کرابێتە کوردیش بەڵام لەبەر ئەوەی کوردێکی زۆر ڕوو لەم فەرمانگەیە دەکەن بۆیە ڕەنگە ئەو کتێبە بە کوردی تەواو بوبێت، چونکە هەموو کەس بۆی هەبوو نوسخەیەك بەخۆڕایی بۆ خۆی بەرێت. بەناچاری دوودانەم لە کتێبەکە دەست دایە یەکێك بە زمانی عەرەبی و ئەوی تریش بە ئینگلیزی و زۆر بەخێرایی کەوتمە هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی، لەوکاتەدا ئەو کەسەی بڕیاربوو ببینم خۆی هاتە پرسگەکە بە شوێنمداو وتی فەرموو با بچینە ژوورەوە. پێش ئەوەی دەست بکەین بە باسی کێشەکەی خۆم پرسیارم لێ کرد وتم: بەڕاست ئەم کتێبە بەکوردی لاتان دەست ناکەوێت؟ وتی: من نازانم ئایا بەکوردی هەیە یان نا. تۆ ئەتوانی پرسیارێ لە چاپخانەکەی بکەیت. وتم: قەیدی نیە بە ئینگلیزی و عەرەبی دەیخوێنمەوە.. پاش تەواو بوونی کارەکەم، بەدەم ڕێگاوە کەوتمە خوێندنەوەی نوسخە عەرەبیەکەی. پاشان لەماڵەوە بە ئینگلیزی خوێندمەوە. سەرنجم دا چەند جیاوازیەکی گەورە لە نێوان هەردوو نوسخەکەدا هەبوو.

بابەتی کتێبەکە ئەوەندە بەلامەوە گرنگ بوو یەکسەر بیرم لەوە کردەوە بۆچی ئەم کتێبە بەکوردی نەبێت، من پێم وایە کورد لە هەموو گەلێکی تر زیاتر پێویستی بەخوێندنەوەی ئەم کتێبە هەیە.. چونکە باس لەکارەساتێك ئەکات کە میللەتەکەمان لە سەرجەم میللەتانی ڕۆژهەلات زیاتر پێوەی دەنالێنێ و تا چەندین سالی تریش ئاسەوارەکانی هەر دەمێننەوەو برینەکانی سارێژ نابن. ئەو کارەساتەش (ئەنفال)ە یان بەواتایەکی تر (جینۆ ساید) یان وەك لەم کتێبەدا ناوەکەیم بە (قەتل و عام) تەرجەمە کرد چونکە ئەو ڕستەی قەتل و عامە گەرچی تەواو عەرەبییە بەلام لە زمانی خەلکە سادەکەی گەلەکەمەوە نزیکە و خەلکی کورد زیاتر لە قەتل و عام تێ دەگات وەك لە جینۆساید یان وشەی ئەنفال و قەتل و عام بەواتای قڕکردن یان کوشتنی بەکۆمەل.

بۆ ڕۆژی دوایی پەیوەندیم کرد بە چاپخانەکەوە پرسیارم لێ کرد ئایا بە کوردی تەرجەمە کراوە یان نا؟ لەوەلامدا وتیان بەداخەوە تا ئێستا بە کوردی نیە.. پێم وتن باشە ئەگەر من تەرجەمەی بکەم، ئێوە ڕاتان چییە؟

وتیان. ئەوە بەدەست ئێمە نیەو دەبێت لەگەل نوسەرەکانی کتێبەکە قسە بکەیت و لەگەل ئەواندا ڕێك بکەویت. ئەدرێس و ژمارەی تەلەفۆنی هەردوو نوسەرەکەیان دامێ کە یەکێکیان پرۆفیسۆرە لە زانکۆی ئۆبسالاو لە سەنتری لێکۆلینەوەی ڕەگەز ئێستا کار دەکات.

پەیوەندیم کرد بە نوسەرەکانەوە، بەلام هەمان ڕۆژ کەسیانم چنگ نەکەوت، چونکە هیچ کامیان لە دەوام نەبوون و تەنها ئەوەندەم بۆ کرا لە سەر جیهازی تەلەفۆنەکەیان پەیامێکم بۆ بەجێ هێشتن و مەبەستی پەیوەندی یەکەمم ئاشکرا کردو ژمارەی تەلەفۆنەکەشم بەجێ هێشت و چاوەڕێ بووم پەیوەندیم پێوە بکەن. پەیتا پەیتاش بەمەلاو لادا بە تەلەفۆن کەوتمە سۆراغیان. تا لەگەل کەسێك لە زانکۆی ستۆکهۆلم قسەم کرد ئەویش زۆر پیاوانە دوو ژمارەی تەلەفۆنی تایبەتی هەردوو نوسەرەکەی دامێ. بۆ عینوانەکەشیان لە ڕێگەی بەریدی ستۆکهۆلمەوە عینوانی فەرمانگەکەیانم چنگ کەوت و کەوتمە نوسینی نامەیەك بۆیان و تیایدا داوام لێ کردن ڕەزامەندی لەسەر تەرجەمە کردنی ئەو کتێبە بۆ کوردی دەربڕن .بەکسەر چومە پۆستەکەی نزیك مالی خۆمان و نامەکەم ڕەوانەکرد، بەو ئومێدەی وەلامێکم لێیانەوە چنگ بکەوێت .پاشان گەڕامە مالەوە، نیوەڕۆ تەلەفۆنم بۆ کرا کە تەلەفۆنەکەم بەرز کردەوە نوسەری کتێبەکە بەڕێز دکتۆر پۆل ا. لیڤین بوو.. پاش سلاو چەند پرسیارێکی تایبەتی لێ کردم کە من کێم و لەگەل چ گروپێکی کوردیدا کارم کردوە. پاش

ئەوەی وەڵامم دایەوە پێی ڕاگەیاندم کە ئەویش زۆری پێ خۆشە کە دەست بکەم بە وەرگێڕانی و پێی وتم پیاوی چاك بە هەر ئێستا دەست پێ بکە.

هەر ئەو شەوە دەستم کرد بەکارو لەماوەی هەفتەیەکدا کارەکەم تەواو کرد و کەوتمە چاککردنی هەڵە و پێدا چوونەوەی نوسینەکە.

من ئەو کتێبەم گەلێك لاپەسەند بوو تا بکرێتە کوردی چونکە گەر بە وردی سەرنجی ڕوداوەکانی ئەو کارەساتە بدەین و لە وردەکاریەکانی بکۆڵینەوە، بۆمان دەردەکەوێت کە ئەو ئەنفالە بەدناوەی ڕژێمی بەعس بەسەر میللەتەکەماندا هێنا، دەقاو دەق کۆپیەکی ئەو قەتڵ وعامەی جولەکەکانە لە جەنگی جیهانی دوهەمدا کە لە لایەن نازیەکانەوە بەسەریاندا هاتوە، ئەگەرچی ژمارەی قوربانیەکانی جولەکە زیاترن بەڵام بیرۆکەی کۆمەلکوژییەکەو چۆنیەتی خۆ بۆ ئامادەکردن و ئەنجامدان و هۆی جینۆسایدەکەش چوون یەکن.

ئەنفال برینێکی گەلێك قولەو گەر بەچاوی ویژدان و هەست کردن بە مەسئولیەتی مێژویی میللەتەکەمانەوە تێی بڕوانین، زۆر ئەستەمە هەر یەکە لە ئێمە، لەهەموو ڕۆشنبیرانی کورد هیمەتێکی دلسۆزانە نەکەن بۆ ڕزگارکردنی ئەو برە دۆکیومێنت و نوسراوانەی دەربارەی ئەنفال و فەرمانەکانی ڕژێم و چۆنیەتی دەست پێ کردن و جێبەجێکردنی ئەو کۆمەلکوژییە و ئەو کەسانەش کە ڕۆلی سەرەکیان تێدا بینیوە و باقی ئەو نوسراوو نامانەی تا ئێستا لەبەردەستدا ماون، زۆر بەپەلە پێویستە بکەوینە کۆکردنەوە و ڕێکخستنیان. پێویستە سەرنجێك بدەین، گەلی جولەکە بەو هەموو هێز و توانا مادی و زانستی و تەکنۆلۆجیەوە و بەوپەڕی دلسۆزیەوە خەریك بوون تا ئەو مێژوە پڕ کارەساتەی بەسەر باوو باپیرانیاندا هاتوە فەرامۆش نەکرێت و زۆر جوامێرانەش کەوتنە دوی ڕاستیەکان و ئەوەندەی بۆیان کراو بۆیان لوا نەیانهێشت ئەنجام دەران و تاوانبارانی ئەو کارەساتە لە تۆلە و سزا دەرباز بن بەڕاستی سەلماندیان کە میللەتێکی هۆشیار و دلسۆز و بەوەفان بەرامبەر مێژوو و وڵاتی خۆیان و مرۆڤ هەندێك جار بەخیلی دێت لەو هەموو دلسۆزیەیان. بە پێچەوانەی ئەوانەوە سەد حەیف و مەخابن ئێمەی کورد میللەتێکین شتمان زۆر زوو بیر دەچێتەوەو لەماوەیەکی زۆر کورتدا سەر سەختترین دوژمنمان لێ دەبێتە دۆست و سەرلەنوێ فریومان دەدەنەوە، چونکە تا ئێستا چەندین جار مێژوی پڕ کارەساتی ئێمە بەدەست دوژمنەکانمانەوە دوبارە بونەتەوە.

لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگە و وێنە و دۆکیومێنت و ئەو باڵا دەستییەی ئێستای گەلی جولەکە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا تا ئێستا چەندین هەوڵی تاك و بەکۆمەڵ لەلایەن نەتەوەپەرست و رەگەزپەرستەکان و توندڕەوەکانەوە دراوە تا ڕودانی ئەو کارەساتە بەدرۆ بخەنەوەو ئینکاری لە ڕودانی بکەن. هەروەك چۆن زۆر لە نەتەوە پەرستە عەرەبەکان تا ئێستاش ئەڵێن ئەو قەتڵ و عامەی جولەکە درۆیە و ڕوینەداوە. . بەهەمان شێوەش ئاشکرایەو دیارە کە زۆر حیزب و ڕژێم و کۆمەڵەی شۆڤێنی نەتەوەیی عەرەبی بۆ پاکانەکردن بۆ ڕژێمی خوێنڕێژ و ڕەفتار فاشستی بەغدا و دەیانەوێت هەموو تاوانەکانی ئەو ڕژێمە بشارنەوە و تا ئێستا چەندین جارە لە چەندین بۆنەدا ڕایانگەیاندوە کە ڕژێمی بەعس هیچ تاوانێکی جینۆسایدی دژی گەلی کورد ئەنجام نەداوەو ئەوەی کورد دەیڵێت و ئیدیعای دەکات دەیخەنە خانەی بێگانە پەرستی و کلکایەتی ئەمەریکاو و هەوڵی دابەش کردنی عێراقەوە.

هەربۆیە گەر هەوڵێکی جدی و کارێکی هەمەلایەنە دەست پێ نەکرێت ئەوا بەدڵنیایەوە پاش دە ساڵی تر هیچ کەس باس لە ئەنفال ناکات و هەموو ئەو کۆمەڵکوژیەش دەبێتە بلقی سەرئاو و ئەو کارەساتە دڕندانەیە لە بیری گەلی کوردا دەسڕێتەوە. چونکە گەر لە ئێستاوە دەست بە تۆمارکردنی ڕاستیەکان نەکرێت ئەوا پاش نەمانی ئەو کەسانەی لە ئەنفال گەڕاونەتەوە کە ئەوانە یەکێکن لە سەرچاوە هەرە گرنگ و باوەڕپێکراوەکانی ئەو کارەساتە لەناو دەچن.

پێویست وایە ئەنفال وەك دەرسێکی مێژوویی لە قوتابخانەکانی کوردستاندا بوترێتەوەو، نەوەکانی دوارۆژ فێربکرێن تا ئاگاداربن کە باوك وباپیرانیان توشی چ کارەساتێکی کۆکوژی بون، لەسەر هیچ نا تەنها لەسەر ئەوەی کوردن و هیچی تر، پێویستە مامۆستایان و دایکان و باوکانی کورد هەرگیز ئەو مەرگەساتەی ئەنفالیان لەیاد نەچێت و هەمیشە بەوپەڕی دڵسۆزیەوە باسی ئەنفال و کارەساتەکانی بۆ نەوەکانی ئەم میللەتە کڵۆڵ و پارچە پارچە کراوەمان بکەن.

ئەرکی سەرشانی هەموو حیزب و ڕێکخراوە کوردیەکانیشە هەوڵ و تەقەللای تەواو بدەن تا ئەو نوسین و دۆکیومێنتانەی تا ئێستا ماون ئەرشیفێکی تایبەتیان بۆ بکرێتەوەو هەوڵ بدرێت چاوپێکەوتن لەگەڵ زۆربەی ئەو کەسانەدا بکرێت کە لە ئەنفال ڕزگاریان بووە تا ئێستا لەژیاندا ماون، پرسیاری تەواو لە هەریەکەیان بکرێت و تۆمار بکرێت. تا گەر کرا لە داهاتودا ئێمەی کوردیش بتوانین ئەنجامدەرانی ئەو تاوانە گەورەیە بەرەو دادگایەکی نێو دەوڵەتی لە وێنەی دادگای نۆرمبێرگ کە بۆ نازیەکان پاش جەنگ سازدرا و بۆ سەرانی بەعس ساز بدرێت لە تۆڵەی ئەو

هەموو تاوانەیاندا سزا بدرێن. تەنها بەوەش ڕۆحی ئەو سەدان هەزار ژن ومناڵ و پیر و گەنجەی میللەتەکەمان کە بە ناهەق شەهید کران لەبەهەشتی بەریندا ئاسودە دەبن و دەسرەون.

وەك هەموو لایەك ئاگادارن لە ڕاپەڕینە مەزنەکەی بەهاری ١٩٩١دا بڕێکی زۆر نوسراوو دۆکیومێنتی پڕ بایەخ کەوتنە دەست جەماوەری ڕاپەڕیوو هێزە سیاسیەکانی کوردستان، بەڵام سەد حەیف زۆربەیان بەهۆی بیری تەسکی حیزبایەتیەوە لەناوچوون و هێندێکیشیان لەلای لایەنە سیاسیەکان پارێزران، من لەیادمە لە دوای دەرپەڕاندنی هێزەکانی ڕژێم لە سلێمانی و کفری وکەلارو دەربەندیخان، کۆمەڵێکی زۆر ئەفسەرو دەرەجەداری سوپای عێراق تەسلیم بەهێزی پێشمەرگەو جەماوەری گەل بوون. کۆمەڵێك لەو ئەفسەرانە وەك میوان، (بەوپێژدانەوە ئەیڵێم وەك میوان چونکە ئەوەی خۆمان دەمانخوارد لەگەڵیاندا بەشمان دەکرد و خۆمان چۆن دەنوستین و چیمان ڕاخەر بەکاردەهێنا ئەوانیش هەمان شێوە) لە بارەگای مەڵبەندی ڕێکخستنی سلێمانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە قەڵاچوالان لەلامان بوون، ئەوکاتە بارەگای سەرەکی مەڵبەند چوبوە سلێمانی ئێمە کۆمەڵێك کادر و پێشمەرگە لە قەڵاچوالان مابوین، من بۆخۆم چەند جارێك کۆبونەوەم بەو سەربازو ئەفسەرانەی سوپای عێراقی کردو لەیەکێك لە کۆبونەوەکاندا کۆمەڵێك وێنەم پیشاندان کە لە ڕاپەڕیندا کەوتبونە دەست هێزی پێشمەرگەو جەماوەری ڕاپەڕیو. وێنەکان هەموویان لەناو بارەگای ئیستخباراتی عەسکەریدا لە کەرکوك گیرابوون. هەریەك لە وێنەکان وێنەی خێزانێك بوو واتە هەر خێزانەو پێکەوە وەستاندبویانن و وێنەیان گرتبوون ژمارەی ئەندامانی خێزانەکان جیاواز بوون. چوار، پێنج، حەوت، کەمتر یان زیاتر، منداڵ و ژن و پیر پێکەوە. لە پشت هەر وێنەیەك ئەم ڕستەیە نوسرابوو کە هەرگیز لەیادم ناچێت چونکە دەیان جار ئەو ڕستەیەم بۆ ئەو سەربازانە دەخوێندەوە. لەپشتی وێنەکان نوسرابوو (عائلە المخرب ......................تم تصفیتهم بتاریخ \ \ ١٩٨٩) واتە خێزانی یاخی بوو فلانی کوڕی فلان هەموویان لەڕۆژی \ \ ١٩٨٩ دا لەناوبران) ئەوەی جێی سەرنجی هەموومان بوو لەناو چەند وێنەیەکدا و لەگەڵ خێزانەکاندا منداڵی ساوای تێدا بوو، چاکم لەیادە یەکێك لەو منداڵانە مەمکە مژەکەی بەدەمەوە بوو.. ئەفسەرێکی عێراقی لێی پرسیم. ئایا تۆ بەڕاستتە ئەو منداڵەشیان کوشتوە؟! وەڵامم دایەوە من نازانم تۆش بەڕاستە ئەو پرسیارە لەمن ئەکەیت، پێم وت من پێویستیم بەوە نیە تۆ باوەڕم پێ بکەیت یان نا، ئەوەتا نوسراوەکانی بەڕێوەبەرێتی ئیستخبارات لەناو ئەم فایلەدایە لات بەجێ دێڵم بۆخۆت باش بیانخوێنەرەوە، ئەوسا تێدەگەی کە نەك هەر ئەم منداڵە ساوایە بەڵکو هەزاران

منداڵی ساوای وەك ئەم کۆرپەیەیان لەناو بردوە. ئێوارە چومەوە لای ئەفسەرو سەربازەکان، پرسیارم لەو ئەفسەرە کرد، ئایا باوەڕی کردوە، وەڵامی دامەوە ئێستا تەواو دڵنیام لەوەی کە ئێوە ئەیڵێن هێشتا کەمە! ئەوسا من شکم هەبوو لەوەی ئەو ئەفسەرە ڕەنگە بۆ پاکانە ئەو پرسیارەی لەمن کردبێت ڕەنگیشە ئاگاداری کاری لەو چەشنە نەبوبێت بەڵام ئەوساش و ئێستاش باوەڕی تەواوم بەوە هەیە کە ئەفسەرێکی سوپای عێراق نیە کە ئاگاداری هیچ نەبێت دەیان تاوانی ڕژێمی بەعس نەبووبێت و جێبەجێی نەکردبێت، جا پێی خۆش بوە یان نا ئەوە پرسیارێکی ترە، گرنگ ئەوەیە زۆربەی هەرە زۆریان لەو تاوانانەدا دەستیان هەبوە و هیچ نەبێت ئاگاداری ئەنجامدانی بوون.

ئەوەی ڕاست بێت نازانم ئەو وێنانە چیان بەسەرهات و لای کێ گیرسانەوە، بەڕاستی هەر یەك لەو وێنانەی ئەوسا لەبەردەستدا بوون شایەتێکی ڕاستەقینەو حاشا هەڵنەگری تاوانی جینۆساید بوون، ئومێدەوارم هەر مابن و لەناو نەچوبن.

وەرگێڕانی ئەم کتێبەش لەلایەن خۆمەوە وەك بچوکترین وەفاو ئەمەکداری دەکەمە چەپکێك گوڵ و بۆ گیانی پاکی ئەو شەهیدە بێ تاوانانەی دەنێرم.

مامۆستا برایم
ستۆکهۆڵم
٧ نیسانی ٢٠٠٠

پـاش ئـەوەی هـەردوو نوسـەرەکە ڕەزامـەندیان لەسـەر وەرگێڕانـی ئـەو کتێبـە بـۆ سـەر زمانی کوردی دەربڕی، پاش تەواو کردنی کارەکەم مـن لەلایـەن خۆمـەوە نامەیـەکم بـۆ نوسـین و لەسـەر دیسـکێك کۆپیـەکی تەرجەمـە کوردیەکەشـم بـۆ نـاردن .ئەمـەش دەقـی تەرجەمـەی نامەکەی خۆمە .

## بەڕێزان دکتۆر پۆل ا. لیڤین و ستیڤان برۆشڤیلد

سلاو

سەبارەت بەو گفتوگۆ تەلەفۆنیەی پێش دووهەفتە پێکەوە کردمان، دەربارەی وەرگێڕانی کتێبەکەتان لەمەڕ (قەتلٌ وعام)، پێم خۆشە کە بە بەڕێزتان ڕابگەیێنم کە من لەلای خۆمەوە کارەکەم تەواو کرد.

هـەروەها دەمـەوێت ئـەوە بڵێـم کە گەلێك هەسـت بـە شـانازی دەکەم بـە ئەنجامدانی ئەو کارەم.

بەڕێزان بڕوام پـێ بکـەن کە چـەند جـارێك لـەکاتی خوێندنـەوەو وەرگێڕانـی کتێبەکەدا فرمێسك بەچاوانما دەهاتە خوارێ، چونکە زۆربەی وێنەو چیرۆکەکانی ئەو خەڵکەی ناو ئۆردوگاکان هەمان ئەو چیرۆك و وێنانەن کە کاتی خۆی بەرچاوم کەوتون یان بیستومن. من خۆم لەسـاڵی ١٩٧٧ دا لەگەڵ بـرا گەورەکەم لەلایـەن هێزەکانی ئیستخباراتی ڕژێمی عێراقەوە گیراین. ئەورژێمە براکەم کـە خوێندکاری پۆلی چواری کۆلیژی زانستی بوو بە لەسێدارەدان حوکمیاندا، تەنها لەسـەر وێنەیەك کە لە ماڵماندا گیرا. پاش ماوەیەك من ئازادکرام.

بەڕێزان حـەز ئەکەم بڕوام پێ بکەن کە گەلی کورد لە کوردسـتانی عێراقدا هـەمان ئـەو تراژیدیایـەی بەسـەر جولەکەدا هـاتوە لەجـەنگی جیهانی دوهـەمدا، بەسـەر گەلی ئێمەشـدا هـاتوە، ئەگـەر چـی دیـارە ژمـارەی قوربانیـەکانی جولەکە زیاتربوون لەهی کورد بەڵام ئەنجامدانی کارەکەو بیرۆکەی ئەو کۆکوژیە هەر یەکن.

من ئومێدەوارم ڕۆژێك گەلی ئێمەش (ڕۆشنبیرانی کورد لە پیاوو ژن) بتوانن هەموو دۆکیومێنت و بەڵگەنامەکانی تاوانی ئەنفال و جینۆسایدی کورد کۆبکەنەوە تا ئەنجامدەرانی ئەو تاوانانە بدرێنە دادگا.

لەگەل ئەم نامەیەمدا کۆپیەکی تەرجەمە کوردییەکە دەنێرم بۆتان، گەرچی دلنیام ئێوە نە بۆتان دەخوێندرێتەوەو نە لێی تێدەگەن، بەلام پێم خۆشە وەك دیاریەکی بچوك قبولی بکەن.

لەگەل ئەوپەڕی ڕێزو سوپاسمدا

ابراهیم خ. احمد
ستۆکهۆلم
٤ ی نیسانی ٢٠٠٠

## سەرەتا

ئەم کتێبە لەلایەن دەولەتی سویدەوە پێشنیارکرا تا ببێتە بەشێك لەو پرۆژە گرنگەی مێژووی زیندوو. دیارە ئامادەکردنی کتێبێك دەربارەی بابەتێکی وا ئالۆزو گرانی وەك (قەتڵ و عام)[1] بە کاتێکی ئاوا کەم و دیاریکراو هێندە کارێکی ئاسان نیە. بەڵام ئێمە ئەو ئەرکەمان پەسەندکرد لەباوەڕی تەواومانەوە بەوەی کە دەبێت کێشەی قەتڵ و عام پتر ڕوون بکرێتەوە. بابەتی قەتڵ و عام هەرگیز ناکرێت وەك کارێکی سیاسی یان بابەتێکی ئیعلامی مامەڵەی لەتەکدا بکرێت. هەڵسەنگاندنی بابەتەکەش بۆ خەڵکی تر بەجێ دەمێنێ حوکم بدەن ئایا تا چ ڕادەیەك سەرکەوتوو بوین لە بەدیهێنانی ئامانجەکانیدا.

هەوڵمان داوە زانیاریەکان لەگەڵ قسەی خەڵکەکاندا یەك بخەین و گەلێك بڕیاری گرانیش هاتۆتە پێشەوە کاتێك ویستمان گوڵبژێرێك لە ڕاو بۆچونی ئەو خەڵکانەی دەکرێت قسەیان وەربگرین لەنێو ئەو هەموو زانیاری و دەنگانەی لەبەردەستدان وەدەست بێنین.

دەربارەی قەتڵ و عام زۆر زانیاری هەیە. بڕیار و فەرمانەکانی ڕوداوەکەش ڕوون و ئاشکران. ڕێگای (ئاوشوێز) لە پڕوپاگەندەیەکی پڕ قین و ڕقەوە گۆڕا بۆ مەسەلەی جیاوازی نێوان مرۆڤ و پۆلێن کردنیان و وەلاتانی مرۆڤ و سوکایەتی پێ کردنی. پاشان ڕاگواستن و ڕاپێچ کردنیان و لەکۆتاییشدا کوشتن و لەناوبردنی ملیۆنەها خەڵك. ئەو خەڵکە لەنێو ئەوروپاداو لەو ئۆردوگایانەدا دەکوژران کە تایبەت بۆ ئەو مەبەستە ئامادەکرابوون.

ئەگەر چی تائێستا بەڕوونی نەزانراوە کە چەند کەس بەهۆی بیری نازیەوەو شیعاری (ڕەگەزی خاوێن)ی ئەڵمانیای مەزنەوە زەرەرمەند بوون. بەڵام دەکرێت بڵێین لەنێوان ٥ تا پتر لە ٦ ملیۆن (جو) جولەکە لەو قەتڵ و عامەدا گیانیان لە دەستداوەو، سەدان هەزار(قەرەج) توشی جینۆساید هاتوون.

فەرمانەکانی نازی بووە هۆی تیاچون و کوشتنی سەد هەزار لە خەڵکی نەخۆش و پەککەوتەو هاندیکاپ (معوق) و هەزاران هۆمۆسیکسوێل و(شایەتانی یەهودا)[2] و ملیۆنێك خەڵکی پۆلۆنیو ملیۆنێك دیلی جەنگی سۆڤێتی و چەندینی تر لەخەڵکی مەدەنی.

بەڵام ئایا ئەم ژمارانە بەتەنها چ مانایەك دەبەخشن؟ ئەوانە تەنها ژمارەن گەر وەك ژمارە تەماشا بکرێن لەگەڵ گەورەیی ئەو ژمارانەدا بەزوویی ماناکانیان لەدەست دەدەن و زۆریش ئاسان بیردەچنەوە، هەر بۆیە گەلێك گرنگە کە بزانرێت کە لەپشت هەر ژمارەیەکەوە ناوێك، خۆشەویستیەك، پاشەڕۆژێکی ون بوو، منداڵ و دایك و باب و خزم و کەسوکار هەیە. هەربۆیەشە ئێمە بەچیرۆکی منالانی (بولنهۆزر دام)

دەست پێ دەکەین. ئەو چیرۆکە کۆتاییەکی ناخۆشی هەیە کە بەداخەوە ئەوە سیمای هەموو قەتل و عامە بەگشتی. نازیەکان نزیکەی ملیۆن و نیوێك منالی جولەکەیان لەکاتی جەنگدا کوشت. ئەمەش مانای وایە کە نۆ منال لە هەموو دە منالێکی جولەکە لە ئەوروپادا گیانیان لەدەستداوە. ئەمە چۆن ڕویدا؟

هیوادارین ئەم کتێبە هەولێك بێت بۆ زیادکردنی زانیاری لە سویدا دەربارەی قەتل و عام. هەروەها دەربارەی چۆنیەتی وتنەوەی ئەم بابەتە لە خوێندنگاکاندا. هیوادارین کە ئەم کتێبە شان بەشانی ئامانجە سەرەتاییەکانی دەولەت بێتە بەشێك لەو هەول و تەقەللا سەرەکیانەی دەدرێت بۆ دیالۆگ لەنێوان باوك و نەوەکاندا دەربارەی دیموکراتی و ڕەوشت و نرخەکانی مرۆڤایەتی، نەك تەنها بۆ ئەمڕۆ بەلکو بۆ داهاتوش.

لەگەل ئەوەشدا ئەم کتێبە دەکرێت بێتە سەرەتایەك بۆ ئەوانەی مەبەستیانە زانیاری زیاتر دەربارەی قەتل و عام وەدەست بێنن. ئەو زانیارانەی لە دوو توێ ی ئەم کتێبەدا جێیان بۆتەوە بەشێکی کەمن لەو هەموو زانیاریانەی دەربارەی ئەو چەند سالە پڕ کارەساتەی جەنگی دوهەمدا وەدەست دەکەون. ئێمە تەنها بە ڕوکەشی مەسەلەکاندا گوزەرمان کردووەو تکامان وایە ئەوانەی مەبەستیانە خۆیان بەدووی زانیاری پتردا بگەڕێن بۆخۆیان هەولی تر بدەن.

ئێمە پێمان خۆشە بەم بۆنەیەوە سوپاسی هەموو ئەوکەسانە بکەین کە هاوکاریان کردین بۆ بەرهەمهێنانی ئەم کتێبە لەو ماوە کورتەدا. بەبێ یارمەتی ئەوان هەرگیز ئەوەمان بۆ مەیسەر نەدەبوو و ئەوانە پتریان لەوە ئەنجامدا کە لێیان چاوەڕێ دەکرا ئەوانەش هەر یەك لە(لینا ئالین) لە خانەی پەخش و بلاوکردنەوەی سروشت و کلتور. (**Natur och Kultur Publishing**) و (ئانا کارین یوهانسۆن) لێپرسراوی پرۆژەو کارمەندی ئیعلامی دەولەت لە ڕۆزنباد و(سانا یوهانسۆن)بۆ ئامادەکردنی وێنەکان و(یاکوب وینگولیوس) ئامادەکەری نەخشەکان و (ئیلسا وۆلفارت) هێلکاریەکان و ماریتا زۆنابند و ئیڤا ئۆکەرباری بۆ تەرجەمەو لە کۆتاییدا دەمانەوێت سوپاسی ئەنیتا کارپ و میا لۆینیارت بکەین کە لەهەموو کارێکدا هاوکاریان کردین و بەبێ یارمەتی ئەوان ئەم کتێبە هەرگیز بەرهەم نەدەهات.

ستۆکهۆلم کانونی دوهەمی ١٩٩٨
ستێڤان بروشفیلد ١ و پۆل ا. لیڤین

## منالان وەك بەرازی غینیا بەکاردێن(٣)

لەسەرەتای ئەپریل (نیسان)ی ١٩٤٥دا هێـزی هاوپەیمانان بەرەو ئەڵمانیای نازی ملی پێوەنابوو بەڵام ئەڵمانیا بەتەواوی تەسلیم نەبوو بوو تا ڕۆژی ٨ی مایس. کاتێك کە جەنگ بەرەو تەواو بوون دەچوو، ئەوانەی تاوانیان ئەنجام دابوو سەرقاڵی ئەوە بوون چەند دەتوانن بەڵگەنامەکان لەناوبەرن.

سەعات ٨ی ئێوارەی ڕۆژی ٢٠ی نیسان لەکاتێکدا هیتلەر دوا یادی جەژنی لەدایك بوونی دەکردەوە. ئەوپاسانەی پێیان دەوترا (پاسە سپیەکان) ئامادە کرابوون تا ئۆردوگای نیونگام کە دەکەوێتە دەرەوەی شاری هامبۆرگ لە زیندانیە ئەسکەندەناڤیەکان خاڵی بکەن و بیانگوێزنەوە. ئەوانەی لەو ئۆردوگایە بەجێمان تەنها بیست منالی جولەکە بوون کە تەمەنیان لەنێوان ٥ تا ١٢ ساڵان بوو. ئەو کۆمەڵە منداڵە پێکهاتبوون لە دە کوڕ و دە کچ. لەنێویاندا دوو جووت خوشك و برا هەبوون. ئەو منداڵانە ئەو ڕۆژە بەر گواستنەوەکە نەکەوتن. بۆ چەند مانگێك بوونە بەرازی غینی و لە یەکێك لەتاقیگەکاندا لە (نیونگامیّ) لەلایەن (کورت هیسمایر)ی پزیشکی تایبەتی SS ەوە تاقیکردنەوەی پزیشکیان لەسەردەکرا. ئەم دکتۆرە لیمفە گرێکانی ئەو منداڵانەی لابردوو و بە دەرزی میکرۆبی (تیوبەرکلۆسس)ی سیلی زیندوی کردبوە ژێر پێستیانەوە. هەروەها ئەو پزیشکە ڕاستەوخۆ بە هۆی بۆریەکەوە میکرۆبی سیلی کردبوە نێو سییەکانی چەند منداڵێکەوە... لەکاتی لێکۆڵینەوەیەکدا کە ساڵی ١٩٦٤ لەگەڵ ئەو پزیشکەدا کرا وتی: کە ئەو هیچ جیاوازیەکی ڕاستەقینەی لە نێوان جولەکەو ئاژەڵدا بەدی نەدەکرد.

پاش چەند سەعاتێك لە ڕۆیشتنی دوا پاسی بەندە ئەسکەندەناڤیەکان ئەو منداڵانە لەگەڵ چوار بەندی تری کامڵ کە چاودێری منالەکانیان دەکرد گواسترانەوە بۆ بینای قوتابخانەیەك لە هامبۆرگ، و لە نیوەشەودا گەیشتنە ئەو شوێنە. بەندە کامڵەکان هەریەك لە دکتۆری فەرەنسی (گابریل فلۆرەنس) و دکتۆر (ڕێنێ کرۆنویلیێ) هەردوو هۆڵەندی (دیرك دیوتکۆم) و (ئەنتۆم هویڵزل) بوون. قوتابخانەکە ناوی (بولن هوسەر دام) بوو کە ماوەی چەند مانگێك بوو وەك بەشێك لە ئۆردوگا بەکاردەهات. هەروەها بۆ کۆکردنەوەی ئەو بەندە ئەسکەندەناڤیانە بەکاردەهات کە بەنیازبون ئازادیان بکەن.



ئەم وێنەیەی سەرەوە سالی ١٩٤٤ پێش نەفی کردنی گیراوە

ئەو کۆمەڵە منداڵە و یاوەرەکانیان برانە ژووری کولاندنەوە (ئەو ژوورانە بۆ سوتاندنی سوتەمەنی بەکاردەهات –وەرگێر–) سەربازەکانی SS لەپێشدا پیاوەکانیان بەو بۆریانەدا هەڵواسی کە بە بنمیچی ژورەکەوە بوون، پاشان سەرەی منداڵەکان هات، هێندێکیان دەرزی مۆرفینیان لێ دابوون. بەپێی گوتەی ئەلفرێد ترێزبنسکی دکتۆری SS یەکێك لەوانە جۆرج ئەندرێ کۆهین بوو کە لە حاڵەتێکی گەلێك خراپدا بوو. لەپێش هەمواندا جۆرج ئەندریێ لەهۆشخۆچوو هەڵواسرا، بەڵام بە یەکێك لەو قولاپانەدا کە بەدیوارەکەوە بوون نەك بە بۆریەکانی بنمیچدا. بۆیە (یۆهان فراهم)ی عەریفەکەی SS ناچار بوو هەموو قورسایی خۆی بەکاربێنێت تا قولاپەکە لەجەستەی هەڵواسراوەکە بچەقێت. پاش ئەوە عەریف فراهام دوو منالی تری بە دوو قولاپی تردا هەڵواسی هەروەك چۆن وێنەیەك هەڵئەواسرێ. کاتێك سالی ١٩٤٦ ئەم عەریفە لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا کرا ڕوداوەکەی گێڕایەوەو وتی هیچ کام لە منداڵەکان لەکاتی هەڵواسیندا نەگریان.

پاش مردنی منالەکان جگەرەو خواردنەوە بەسەر سەربازەکانی SS دا بەخشرایەوە. پاشان سەرەی گروپی دوهەم هات تا هەڵبواسرێن _ ئەم جارەیان بیست بەندی سوڤێتی بوون، ئێمە ناوەکانیان نازانین بەڵام ناو و تەمەنی ئەو منداڵانەی هەڵواسران ئەمانە بوون: مانیا ئالا مان ٥ ساڵان، لێنکا بێرنباون ١٢ ساڵان، سورسیس گۆلدینگەر ١١ ساڵان، ڕیوکاهێرزباری ٧ ساڵان، ئەلیکساندەر هۆرنمان ٨، ئێدوارد هۆرنمان ١٢، ماریك جەیمیس ٦، جەنگلیب ١٢، لیا کلیگرمان ٨، جۆرج ئەندرێ کۆهین ١٢، بلومیل مێکلار ١١، جاکلین مۆرینستێرن ١٢، ئێدوارد ڕێخنباون ١٠، سیرگیودی سیمۆن ٧، مارکی ستین باون ١٠، ه.هاسەرمان ٨، ئێلینۆرا ویتنۆسکا ٥، ڕۆمان وینۆسکا ٧، ڕۆمان زیللەر ١٢، و ڕۆشلا زیلبیرباری ٩ ساڵان..

ڕۆژانی دوایی لاشەکانیان بردنەوە بۆ نیونگامێ و لەوێ سوتێنران. ئەمڕۆ ئەو قوتابخانەیە پێی دەگوترێت (جانبوزکورزاك).



لە ١٧ی ئابی ١٩٤٤ دا جۆرج ئەندرێ کۆهین ی تەمەن ١٢ساڵان لەگەڵ خێزانەکەیدا لە پاریسەوە بۆ (ئاوشویز) نەفی کران. شەمەندەفەرەکەیان ٧٩ هەمین شەمەندەفەر بوو و یەکێك بوو لە دوا سەفەری نەفی کردنەکانی جولەکە فەرەنسی یەکان. کە گەیشتنە ئاوشویز جۆرج ئەندرێ جیاکرایەوە بۆ تاقیکردنەوەی پزیشکی و لە مانگی(تشرینی دوهەم)دا ڕەوانەی ئۆردوگای نیونگامێ کرا. ئەم وێنەیەی سەرەوە لەلایەن عەریفی SS کورت هیسینمایەرەوە لە نیونگامێ پاش دەرهێنانی لیمفەگرێکانی ئەندرێ گیراوە

هیچ شتێك نیە هێندەی چەوساندنەوەی ڕەگەزێکی تر لە قەناعەتەوە هاتبێت. ئەو کەسەی لەڕەگەزێکی خاوێن و بەرزە هەرگیز ئەو هەستەی لە بیرناکات. ڕەگەز مرۆڤ بەرەو بڵندی دەبات بەوەی لە ڕاستەقینەی خۆی دادەماڵێت و هێزێکی نوێی پێ دەبەخشێ کە دەکرێت بڵێین ئەو هێزە لەسەرو سروشتەوەیە و بەمەش لەو مرۆڤەی سادەیەی جوێ دەکاتەوە کە بە جیهاندا بڵاوبونەتەوە.

ه س. چامبەرلینگ. .بیری ڕەگەز پەرستی ئەوروپا.

**پێشەکی**

ناکرێت مێژوی نازی لە جیهانی نازی و بیری نازی جوێ بکرێتەوە. قەتڵ و عام یەکێك بوو لە دەرئەنجامەکانی بیری سۆشیالیستی نەتەوەیی کە بەڕوونی لە کتێبەکەی هیتلەردا (خەباتم) بەدی دەکرێت. هیتلەر و حزبە سیاسییەکەی (نازی) هەرگیز توندڕەوی و بیری ڕەگەز پەرستی خۆیان حەشار نەداوە و کینەو ڕقی خۆیان بەرامبەر دیموکراتیەت وکۆمەڵ ئاشکرابوون. بۆ نازیەکان ڕەگەز هەموو شتێکە، مرۆڤیش هیچ نرخێکی نەبوە غەیری ئالەتێك نەبێت لە دەوڵەتی نازیدا.

پیادەکردنی ئەم بیروڕایەش یەکسەر دوای گرتنەدەستی دەسەڵات لە ٣٠ کانونی دوهەمی ١٩٣٣دا دەستی پێ کرد.

## پێشینەیەکی بیری ڕەگەز پەرستی

ماوەیەکی درێژ پێش هاتنە سەرحوکمی نازیەکان، بیری ڕەگەز پەرستی لای زۆر لە ئەوروپیەکان چەسپی بوو. هەر لەسەرەتاکانی سەدەی حەڤدەهەمدا هێندێك لە فەیلەسوف و ڕۆشنبیرەکان چەندشتێکیان دەربارەی جیاوازی ڕەگەزەکانی مرۆڤ بلاوکردەوە. ساڵی ١٨٥٤ زانا و دبلۆماتی فەرەنسی (ئارتەر دی گۆبینیاو) کتێبێکی دەربارەی (جیاوازی ڕەگەزەکانی مرۆڤ) بلاوکردەوە. بەبۆچونی ئەو ئەو ڕەگەزەی پێی دەلێن (ئاری) لەهەموو ڕەگەزەکانی تر بالاترە، بەلام هەڕەشەی تێکەلاوبوونی لەگەل ڕەگەزەکانی تری غەیرە ئاری لەپێشە، کە لە(ئاری) نزمترن. ئەم بیرە لەلایەن نەتەوەپەرستە ئەوروپیەکانەوە گەلێك پەسەند بوو لەکاتێکدا بیری نەتەوایەتی ئیمپریالی ڕۆلێکی بەرچاوی هەبوو لە ئەوروپادا.

بە گەڕانەوە بۆ تیۆریەکەی چارلس داروین کە دەلێت (مانەوە و گەشەسەندن بۆ باشترین و بەهێزترینە) تیۆریستە نەتەوەپەرستەکان ئەم بیرۆکە بایۆلۆجیەیان لەسەر کۆمەلگای مرۆڤ پیادە دەکرد. بەپێی بۆچونی داروین و داریونیزم (بەهێز)مافی هەیە زال بێت بەسەر(لاوازدا)و حوکمی بکات.یەکێك لەو فەیلەسوفانەی ڕۆلێکی زۆری گێڕا (ئێچ ئێس چامبەرلینگ)ی ئەنگلۆئەلمانی بوو. ساڵی ١٨٩٩ بۆچونێکی بلاوکردەوە تیایدا دەلێت کە ڕەگەزی جێرمانی پێشەوای ڕەگەزەکانەو ئەتوانێت ئەوروپای مەسیحی لە دوژمنەکانی کە جولەکەن ڕزگار بکات.

## بیری دژە سامی و بایۆلۆژیای ڕەگەز پەرستی

جولەکە هەر لەدێرزەمانەوە لە ئەوروپادا ژیاون. ئەگەرچی جولەکەکان کاتی خۆی لەلایەن ڕۆمانیەکانەوە دەکوژران و کەنیسەش لەسەرەتای سەدەکانی ناوەڕاستەوە لۆمەی جولەکەیان دەکرد لە کوشتنی مەسیحدا و لەوەی کە نایانەوێت عیسا بە مەسیح دابنێن. لەبەرهەموو ئەوهۆیانە باری جولەکەکان بەرەوخراپی دەچوو، بەمەش ئازارو ڕاوەدونان و کوشتنی جولەکەکان بەشێوەیەکی

بەرفراوان پەرەی سەندو چەندین قەسابخانەیان بۆ دانان. پاش شۆڕشی فەرەنسا ساڵی ١٧٨٩ و بەهۆی پیادەکردنی جۆرێك لە دیموکراتیەتەوە باری جولەکەکان بەرەوباشتر چوو. لە سەدەی نۆزدەهەمیشدا ئەوەی پێی دەگوترێت (بەشدارکردن یان ئازادی جولەکەکان) کارێکی وای کرد کە جولەکە بەرفراوانتر بەشداری چالاکیە مرۆییەکان بکەن لەناو کۆمەڵگای ئەوروپیدا. لەدوایەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا و بەهۆی ئەو ئازادیەی جولەکەکان بەدەستیان هێنابوو جۆرێکی تر لەدژایەتی کردنیان و جۆرێکی تر دژە سامی[1] سەری هەڵدا. دژایەتی کردنی جولەکە تەنها بۆ کاری دینی نەبوو بەڵکو شێوەی سیاسیشی بەخۆیەوە بینی. لەوکاتانەدا کە بارودۆخی ئابوری و سیاسی و ڕۆحی لەوپەڕی خراپیدا بوو، بیری دژە سامیەکان جولەکەیان بەوە تاوانبار دەکرد کە گوایە نفوزیان زۆر زیادیکردووەو پیلانێکی نهێنیان بەدەستەوەیە تا دەسەڵات لەجیهاندا بگرنە دەست.

کێشەی جولەکە تەنهاکێشەی ڕەگەز یان بازرگانی نیە، کێشەی ڕەگەز و کولتور و شارستانیەتە. کارەساتێکی دەوڵەتە ئەوروپیەکانە.

بار ئیمانوێل لیتاندر. بازرگانێکی سوید و ئەندامی پەرلەمان.



ئەم یاریە ناوی "Juden raus[5]"ە واتە جولەکە بۆ دەرەوە. لە سیەکاندا لەلایەن کارگە ئەلمانیەکانەوە پێشنیارکرا و دروستکرا، وەك یاریەکی خۆش بۆ گەورەو بچوك. ئەو کڵاوانەی لەسەری پارچەکانی یاریەکەدایە هەمان شێوەی ئەو کڵاوانەی هەیە کە لەسەدەکانی ناوەڕاستدا جولەکە ناچاردەکران لەسەری بکەن. لەسەر کڵاوەکانیش کاریکاتێری دژ بە جولەکەیان لەسەر نەخش کراوە. هەروەها لەسەری نوسراوە: ئەگەر توانیت ٦ جولەکە بکەیتەدەرەوە ئەوا سەرکەوتنێکی چاکت بەدەست هێناوە.



ئەندامێکی (لاوانی هیتلەر) دەرسی کیژۆلەیەك لە موستەعمەرەیەکی ئەلمانی لە پۆلۆنیادا دەدات. . ئەم موستەعمەرانە لە ئەوروپای ڕۆژهەڵاتدا بۆ ئاسایشی ئەلمانیا دامەزران و ناویان لێنان (پانتایی ژیان) و بەو پێیەش دانیشتوانەکەی لە کێلگەکانیان دەردەکران و ئەلمانی تیدا نیشتەجێ دەکرا.

لەهـەمان کـاتدا پـەرە بـە بـیری داروینی دەدرا. ئەمـەش بوەهـۆی ئـەوەی بزوتنـەوەی (ئەیوجینیك)[6] پەرەبسێنی ئەمە پێشی دەوترا (جینە باڵای ڕەگەز) Racical Hygien بیرۆکەی ئەیوجینیك دەلێت جینە لاوازەکان هەڕەشەیەکی ڕاستەقینەن بۆ سەر کۆمەلگا و ئەتوانرێت کۆمەلگا لە فەوتاندن بپارێزرێت بەوەی ڕێگە نەدرێت ئەو جینە لاوازانە بەهۆی زاووزێوە گەشەبسەنن و زۆر بن. بیرۆکەی بزوتنەوەی ئەیوجینێك لە سەرەتای سەدەی بیستدا لەئەوروپادا و ئەمەریکادا پیادە کراو بەم پێیەش سەدان هەزار مرۆڤ نەزۆك کران کە زۆربەیان ژن بوون.

جەنگی یەکەمی جیهانی ١٩١٤ _١٩١٨ بۆ جیهانی ڕوون کردەوە کە کۆمەلگای پیشەسازی توانایەکی لەڕادەبەدەری هەیە بۆ لەناوبردنی مرۆڤ. زۆربەی ئەندامانی حیزبی نازی جەنگاوەرو بەشداری جەنگ بوون و ئاگاداری کارەساتەکان بوون. ئەلمانیا جەنگەکەی دۆڕاند و ئەو ژمارە کەمەی جولەکەی ولاتەکەیان بەهۆی سەرەکی ئەو دۆڕاندنە تاوانبار دەکرد[7] و داوایان دەکرد تۆلەیان لێ بکرێتەوە. نازیەکان دەیان وت بۆ ڕزگارکردنی ئەلمانیا و ژیانەوەی دەبێت سیاسەتی بایۆلۆجی ڕەگەز پەرستی پیادە بکرێت. ئامانجی گەیشتن بە (ڕەگەزێکی خاوێن) و کۆمەلگایەکی لێکچوو کە جیاوازی نێوان مرۆڤەکان حسابی بۆ بکرێت. یاساکانی (نۆرمبێرگ)ی ساڵی ١٩٣٥ دەربڕینێکی ڕاستەقینەی ئەم بیرۆکەیە بوو. ئامانجی ئەم یاسایەش جیاکردنەوەی جولەکەکان بوو لە کۆمەلگا و پاشان (قەرەج)یش وەبەر ئەو جیاکردنەوەیە کەوتن. تەنها (خەلکی ئەلمانی یان ئەوەی خوێنی ئەلمانی تێدایە)[8] هەقی هاوولاتێتی تەواوی هەیە. پسپۆڕەکانی یاسادانان (یاساناسەکان)کە ئەم یاسایەیان هێنایە کایەوە وایان ڕاگەیاند کە (لە دژی ئەوانەی دەلێن خەلکی یەکسانن.. سۆشیالیستی نەتەوەیی چەند ڕێنماییەکی گرنگ و پێویست دەخاتە بەرچاو دەربارەی جیاوازیەکان لە نێوان مرۆڤدا ...)

ئەم بیرۆکەیە فاکتەرێکی بەهێز بوو بۆ هێنانە کایە و پیادەکردنی قەتلٌ و عام و ڕێی سایکۆلۆژی و تەکنیکی بۆ خۆش کرد. لە ساڵی ١٩٣٣ وە تا ١٩٤٥ و بیری هیتلەرو حیزبی نازی بونەهۆی کوشتن و جینۆساید بەشێوەیەکی فراوان.

N° 413 SÉRIE :

PRÉFECTURE D'INDRE-&-LOIRE

JUIVE

**Carte d'identité**

Signature du titulaire :

Anny Horowitz

Empreinte digitale :

Nom : HOROWITZ

Prénoms : Anny- Yolande

Profession : sans

Née le 2 Juin 1933

à STRASBOURG

Département du Bas Rhin

Domicile : 21, rue Rode - BORDEAUX (Gironde)

A TOURS , le 4 Décembre 1940

Le Préfet,

*Signalement :*

Taille :

Cheveux :

Moustache :

Yeux :

Signes particuliers :

Nez : rec.

Forme générale du visage : ell.

Teint : rosé

Corp. : moy.

ناسنامەی ئانی هۆرۆویتز

پاش ئـەوەی ئەڵمانـەکان فەرەنسـایان داگیرکرد ، هـەموو جولەکەکان سـەرنوس کران. ئەمەش یەکەم هەنگاو بوو بەرەو قەتڵ و عام.
ئانی هۆرۆویتز جولەکەیەکی فەرەنسی بوو ساڵی ١٩٣٣ لە ستراتسبۆرگ لەدایك بووە .بەپێی ناسنامەکەی (جولەکەیە و بیانیە ، لەژێر چاودێریدایە ) . پاش گیرانی ڕەوانەی ئۆردوگای تورز کرا پاشان گواسترایەوە بۆ کامپی درانسی لە دەوروپشتی پـاریس. لـە ١١ ی (ئـەیلول)ی ١٩٤٢ دا بـە قیتـاری ژمـارە ٣١ لـە فەرەنسـاوە گواسـترایەوە بۆ ئاوشویز. لە هـەمان قیتاردا (فریـدای)ی دایکی و (پـاولیت)ی خوشکی لەگەڵدا بوو کە تەمەنی ٧ ساڵان بوو. نزیکەی ١٠٠ کەس لە ژن و پیاو و منداڵ لەو قیتارەدا بوون. هەر بەگەیشتنیان نزیکەی ٦٠٠ کەسیان کە هـەموو مناڵەکانی تێدا بوو یەکسەر بەرەو ژوری گاز (Gas chamber) بران.
ئانی و پاولێت دوو منال بوون لـەو یـەك ملیـۆن و نیـو مناڵـەی جولەکە کە لەقەتڵ و عامەکەدا لەناوبران. تەنها یەك لەسەر دەی مناڵانی جولەکە پاش جەنگ لە مەرگ دەرباز بوون. لە هێندێك لە وڵاتانی وەك پۆلۆنیاو وڵاتانی بەڵتیق ژمارە و ڕێژەی ئەو مناڵانەی ڕزگاریان بوو زۆر کەمتر بوو.

شان بەشانی ماڵ و قوتابخانە، پێویستە هەموو لاوانی ئەڵمانی لە نێو ڕیزەکانی (لاوانی هیتلەر)دا لە هەموو لایەنەکانی گیانی و بەدەنی و نەتەوەیی بە بیری سۆشیالیستی نەتەوەیی پەروەردە بکرێن. لە پێناوی بەرژەوەندی گەل و کۆمەڵگادا.

لە یاساکانی ڕێکخراوی (لاوانی هیتلەر) [٨]

## قەرەج

ئەو كۆمەڵەخەڵكەی بە قەرەج یان (ڕۆم) ناودەبرێن كاتی خۆی لە باكوری هیندستانەوە بە ڕێی وولاتی فارس و ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست و ولاتانی بەلقاندا گەیشتونەتە ئەوروپا. زۆر جاران توشی چەندین كێشە بوون و توشی ڕاوەدونان و چەوساندنەوە هاتوون و زۆر جار تاوانی جاسوسی و خیانەتیان دراوەتە پاڵ و هەر وەك جولەكەكان قەرەجیش هێندێك جار بە بكوژی مەسیح تاوانبار كراون. بۆ سەدان ساڵ ئەوروپیەكان قەرەجیان دەكوشت و هێندێك جاریش وەك گیانداری كێوی بەئاشكرا ڕاویان دەكرد (ڕاوە قەرەج Gypsy hunt)كە بەهەمان شێوەی ڕاوە حەیوانەكێوی، قەرەج ڕاودەكران.

لەم دواییانەدا هێندێك لە قەرەجەكان هەر بەردەوام بوون لە ژیانی كۆچ و ڕەوو هێندێكیشیان لە شارەكاندا نیشتەجێ بوون و سەرقاڵی بازرگانی و ژیانی ڕۆژانە بوون. لە هەندێك شوێن وەك كۆمەڵێكی نەتەوەیی تەماشایان دەكردن و لە هێندێك جێی تر وەك چینێكی نزم سەیریان دەكرا. بۆ سەدان ساڵ دەچێ لە ئەوروپادا كە چەندین حیكایەت و چیرۆكی ئەفسانەیی بە قەرەجەوە گرێ دراون و هێندێكیان تا ئێستاش لەزۆر شوێندا باوەڕیان پێدەكرێ و تا ئێستاش لە زۆر شوێنی ئەوروپادا پێیان وایە قەرەج منالان دەفرێنن و سیحرو نوشتەبازی دەكەن و نەخۆشی ترسناك بلاودەكەنەوە.(١١) بێ بڕوایی و دوو دڵی بەرامبەریان نەبوونی بەزەیی بەرامبەریان تا ئێستاش بەقوڵی لە زۆر شوێندا هەیە.(١٢)

## قەرەج و بیری ڕەگەز پەرستی

كاتێك نازیەكان هاتنە سەرحوكم، ملیۆنەها قەرەج لە ئەوروپادا دەژیان و لەوانە ٣٠٠٠٠ سی هەزاریان لە ئەلمانیا دەژیان. لەوانە هێندێكیان لە كەرەڤانەدا وەك كۆچەر دەژیان و هێندێكیشیان لەناوشارەكاندا جێگیربوبون.

ناكرێت بلێین چەوساندنەوەی قەرەج بەهاتنی نازیەكان دەستی پێ كرد. بۆ نمونە چەندین ساڵ بوو كە نوسینگەیەكی تایبەت هەبوو بۆ ناونوس كردنی قەرەج بەناوی (بیرۆی زانیاری دەربارەی قەرەج Gypsy informations bureau) كە ئیشیان ناونووس كردنی قەرەج و ئاگاداركردنەوەی خەڵك بوو لە تێكەلاو بوون لەگەڵیان بەتایبەت مەترسی تێكەلاوبوونی ڕەگەزی.

ساڵی ١٩٠٥ دەلیلێك بڵاو کرایەوە کە تیایدا زانیاری جینی (لێك نزیکی یان خزمایەتی) و کۆمەڵێك وێنەی فۆتۆگرافی سەدان قەرەجی ئەڵمانی تیدابوو. ولایەتی باڤاریا ساڵی ١٩٢٦ یاسایەکی دژی قەرەج پەسند کرد بەناوی (دژایەتی کردنی قەرەج و کۆچەری و ئەوانەی پێیان شەرمە کاربکەن) ئەو قەرەجانەی بێکارن ناچار دەکران بچنە ئەو شوێنانەوە کە پێیان دەوترا (خانەی ڕاست کردنەوە یان چاك کردن). نازیەکانیش پاش ساڵی ١٩٣٣ هەمان یاسایان پەیڕەو کرد. بەهەمان ئەو بیرو بۆچون و هەمان ئەو ڕەفتارانەی لەگەڵ جولەکە دەکران لەگەڵ قەرەجیش بەهەمان شێوە ڕەفتار کرا.

ئەگەر چی (هێنریك هیملەر)ی سەرۆکی هێزەکانی SS پێی وابوو ڕەگەزی ئاری خاوێن هێشتا لەنێو هێندێك قەرەجدا ماوە، بەڵام بیرۆکەی سەرەکی ئەوەبوو، کە ئەوانە ڕەگەزی تێکەڵاون وە تەنها بیۆلۆجیای ڕەگەز دەتوانێت بڕیار لەسەرئەوە بدات کە کێ دەبێت بکوژرێت و کێ بهێڵرێتەوە.

یاسای بایرن (باڤاریان) بۆ قەدەغەکردنی قەرەج و کۆچەری و تەمەڵ و بێ کارەکان ١٦\تموز\١٩٢٦

بڕگەی ١

تەنها ئەو قەرەج و کۆچەریانەی مۆڵەتی هاتوچۆ کردنیان لەلایەن پۆلیسەوە یان لایەنی بەرپرسەوە هەیە، دەتوانن بە کەرەڤانەکانیانەوە هاتوچۆ بکەن.

ئەم مۆڵەتە تەنها بۆ یەك ساڵە و یەك جاریش دەدرێت و هەرکات ویستڕا ئەتوانرێت ئەو مۆڵەتەی لێ بسەندرێتەوە

بڕگەی ٢

قەرەج و کۆچەری بۆیان نیە لەگەڵ ئەو منداڵانەی لە تەمەنی قوتابخانەدان هاتوچۆ بکەن. پۆلیس و لایەنی بەرپرس دەتوانن ئەو مۆڵەتە بدەن ئەگەر بۆیان ڕوون بۆوە کە ئەومنداڵانەی لەگەڵیانن فرسەتی خوێندنیان بۆ دەستەبەرکراوە.

بڕگەی ٣

قەرەج و ئەو کۆچەریانەی کە لەسەرو ١٦ ساڵەوەن ناتوانن بیسەلمێنن کە کاردەکەن، دەکرێت لەلایەن پۆلیس و لایەنی بەرپرسەوە بگیرێن و بۆ ماوەی دوو ساڵ ڕەوانەی خانەی کارکردن بکرێن. ئەمەش بە



# (ترۆلمان)ە قەرەج

لە مارسی ١٩٣٣ دا (ئێریك سیلینگ)ی پاڵەوانی کێشی مام ناوەندی بۆکسێنی ئەڵمانی پلەی یەکەمیەکەی لێ داماڵرا. تەنها لەبەرئەوەی جولەکەبوو. ئەوپلەیەش تا مانگی حوزەیرانی هەمان ساڵ بە بەتاڵی مایەوە. پاشان دوو پاڵەوانی تەواو لەیەك جیاواز دژی یەکتر یاریەکەیان دەست پێ کرد. لە یەکێك لە گۆشەکانی یاریگاکە (ئەدوٚلف ویت) ڕاوەستابوو کە لە ڕەگەزی ئاری بوو. لە گۆشەکەی بەرامبەری یوٚهان ترۆلمان وەستابوو. ئەگەرچی یەکێتی بۆکسێن کە نازیەکان سەرپەرشتیان دەکرد پێیان خۆش نەبوو کە ترۆلمان بۆ ئەو پلەیە یاری بکات. هۆیەکەش ئەوەبوو کە قەرەجە و لەناو خەڵکیشدا بە ترۆلمانە قەرەج ناوبانگی وەك باشترین پاڵەوانی بۆکسێن دەرکردووە. نازیەکان زۆر ڕای خەڵکیان لا گرنگ بوو بۆیە یەکێتی بۆکسێن ناچار بوو تا ئەو یاریەساز بکات. یەکێتی بۆکسێن (ڤیت)ی هەڵبژاردبوو بۆ ئەم پێشبڕکێیە چونکە کەسی تر نەبوو کە بتوانێت بەرامبەر ترۆلمان بوەستێت.

بەڵام لە ٩ی حوزەیراندا ڤیت لە بەرامبەر دوژمنە سەرسەختەکەیدا زۆر بەخراپی دۆڕا. لەماوەی هەر ١٢ خولی یاریەکە ترۆلمانی تەمەن ٢٦ ساڵان هەر سەمای دەکرد بەدەوری ڤیت داو بۆکسی تێ دەسرەواند. یەکێتی بۆکسێن گەلێك ئەم ئەنجامەیان پێ ناخۆش بوو و ڕایانگەیاند کە هەردوو یاریکەرەکە وەك یەکن (تعادل)ن. بینەرەکانی یاریەکە وروژان و بۆ ماوەی چەند دەقیقەیەك دەستیان بەهاوارکردن کردو هەڕەشەی ئەوەیان کرد کە هۆڵەکە هەڵدەگێڕنەوە. ئەوەش بوەهۆی ئەوەی ڕێکخەرانی ئەو یاریە پاشگەز بنەوەو ڕایگەیێنن کە ترۆلمان پاڵەوانی کێشی ناوەنجی ئەڵمانیایە. . گۆڤاری بۆکسێن کەناوی (بۆکس سپۆرت)بوو کەوتە هێرش کردنە سەر ترۆلمان و وتیان: یاریەکەی زۆر دور بووە لە بۆکسێنەوە و وەك نمایشی شانۆیی وابوە،وە دەستیان کرد بە توانج تێگرتنی و تانە دان لەوەی (قەرەجێکە شکی تێدا نیە). پاش هەشت ڕۆژ ترۆلمان پاڵەوانێتیەکەی لێ سەندرایەوەو کۆتاییان بە بۆکسێنەکەی هێنا.

بەڵام یاریەکی تریان بۆ ڕێکخست و لەویاریەدا ترۆلمان قژی زەرد کردبوو، ئەم جارەیان لەبری ئەوەی بکەویتە سەماکردن لەناوەڕاستی یاریگاکەدا وەك داربەڕویەك چەقیو یەك لەدوای یەك بۆکسی بەردەکەوت، تا لە خولی پێنجەمدا هەموو گیانی خەلتانی خوێن بوو کەوتە سەر زەوی.

پاش ماوەیەك سێ برای ترۆلمان ڕەوانەی ئۆردوگا کران و ترۆلمان خۆی پەیوەندی کرد بە سوپای سۆڤێتەوە و لە هێزی پیادەی سۆڤێتیدا دەجەنگا. تا سالی ١٩٤٢ کاتێك بە مۆلەت لەمالەوە بوو لەلایەن (جستاپۆ)ەوە دەستگیر کراو ڕەوانەی کامپی (نیونگامێ) کرا. لەوێ ناچار دەکرا کە قورسترین کار ئەنجام بدات. لە ئاهەنگەکانی SS دا ئەفسەرەکانی هێزی تایبەت گالتەیان پێ دەکرد و بۆ کات بەسەربردنی خۆیان بەگالتەجاریەوە بۆکسێنیان لەگەل ترۆلمانی پالەوانی تەمەن ٣٥ سال دەکرد. تا لە ٩ی شوباتی ١٩٤٣ دا لەلایەن SSەوە تەقەی لێ کراو لە نیونگامی کوژرا.

لەیەك کاتدا و لەهەمان کاتدا کۆمەلێك لەو هۆمۆسێکسوێلانە لە شارەکەی ئێمە گیران. لە نێویاندا هاوڕێیەکی منی تێدا بوو کە هاوڕێیەتیم لەگەلیدا دەگەڕایەوە بۆ ئەو کاتەی تەمەنم ٢٣ سالان بوو. ڕۆژێك جستاپۆ هات بۆ مالەکەی و بردیان. سۆراخ کردنی هیچ کەلکی نەبوو. هەر کەسیش سۆراخی بکردایە دەگیراو ئەوەش بەس بوو تا شك بخزێتە سەر ئەویش. پاش ئەوەی ئەو هاوڕێیەم گیرا جستاپۆ مالەکەیانی پشکنی (....) خراپترین شت ئەو دەفتەری ئەدرەسانە بوو کە لە مالەکەیدا بەدەستیان کەوت. هەر کەس ناوی لەو دەفتەرەدا هەبوو گیرا. منیش هەروەها (....) پێویست بوو زۆر وریابین لە هەموو پەیوەندیەکانماندا و پێویست وابوو پەیوەندی بە گشت هاوڕێکانمەوە بپچڕێنم. لەسەر شەقامەکان بەبێ دەنگ بەلای

یەکتریدا ڕەت دەبوین تا کەسمان توشی بەڵا نەبین، شوێنێك نەما هۆمۆسێکسوێلەکان یەکتری لێ ببینن.
قسەی هۆمۆسێکسوێلێکی ئەلمانی لە کاتی شایەتی داندا

## هۆمۆسێکسویلەکان (نێربازەکان)

هەر پاش ئەوەی نازیەکان حوکمیان گرتەدەست، کەوتنە ڕاوەدوونانی هۆمۆسێکسوێلەکان. سەرکردەکانی نازی پێیان وابوو بوونی ئەم گروپە مەترسی لەسەر ڕادەی زاووزێ لە نێو ئەلمانیەکاندا و مەترسییە لەسەر تەندروستی لەسەر مەسەلە ڕۆحیەکانی نەتەوە. چەند کۆمەڵێك لە هێزەکانی SS پەلاماری ئەو شوێنانەیان دەدا کە شکی بوونی ئەو جۆرە کەسانەیان لێ دەکرد وەك نادیەکانی شەوانە یان ماڵەکانیان. هەروەها پۆلیسیش تەنگی بە هۆمۆسێکسوێلەکان هەڵچنی. ئەم ڕاوەدوونانە کۆتایی بەماوەیەکی درێژی بەرەڵایی هۆمۆسێکسوێل هێنا. دەولەت پشتگیری و پاڵپشتی چەندین یاسای کرد کە پێشتر لە دژی ئەو کەسانە دەرکرابوو. شاڵاوی گرتن بۆ سەر ئەو کەسانە پەرەی سەندو لە سییەکاندا ئەو کەسانە بەردەوام دەگیران و ڕاوەدونانیان توندتر دەبوو. (هێنریك هیملەر)ی سەرۆکی ئیس ئیس سجلێکی تایبەتی لە مەکتەبەکەی خۆی لەبەردەستدا بو کە تایبەت بوو بۆ ناونوس کردن و ڕاوەدونانی ئەو کەسانە. زۆر لە ئەندامانی حزبیش داوای ئیعدام کردنی ئەو هۆمۆسێکسوێلانەو بەد ڕەوشتەکانیان دەکرد.

لە کۆتایی سیەکاندا ژمارەی ئەوکەسانەی هۆمۆ بوون گەلێك زیادی کردو پتر لە ملیۆن و نیوێك هۆمۆسێکسوێل لەوانە پتر لە ١٠٠ هەزار پیاو گیران ١٠ تا ١٥ هەزاریان لێ ڕەوانەی ئۆردوگاکان کرا و هەریەکەیان بە سێگۆشەیەکی پەمەیی لەسەر جلەکانیان نیشانە کرا بوون. ئەمەش بوە هۆی ئەوەی لەلایەن سەرانی ئیس ئیس و پاسەوانەکان و هێندێك لە بەندیەکانیش هەڵسوکەوتی خراپیان لەگەل بکرێت و بەم پێ یەش هەزارانیان گیانیان لەدەستدا. تەواو ژمارەی ئەوانەی گیانیان لەدەست دا تا ئێستا نەزانراوە بەڵام وامەزەندە دەکرێت کە ٦٠٪ یان کوژرابن.

بۆ چارەسەرکردنی کێشەی ئەوانە نازیەکان چەندین تاقی کردنەوەی پزیشکیان لەسەریان ئەنجام دا تا ڕەوشتی هۆمۆیان بگۆڕن.

هاندیکاپ (معوق) و پەککەوتە و (گێل)ەکان.

لە بیستەکاندا کۆمەڵێك لە زانا ئەلمانیەکان کوشتنی ئەو کەسانەیان پەسەند کرد بەبێ سود و بێ هیوایان دەزانین. بەم پێیەش کۆمەڵێك لە معوق و گێل و شێت و پەککەوتەکانیان ناونابوو (ئەو ژیانەی هەقی ژیانی نیە). ئەم بیرۆکەیە بەخێرایی لای نازیەکان پەسەند کرا چونکە خۆیان داوای کۆمەڵگایەکی پاکی بێ نەخۆشیان دەکرد کە کەسی گێل و پەککەوتەی تێدا نەبێت. جولەکە و قەرەج وەك دوو مەترسی دەرەکی بۆ سەر جەستەی نەتەوەی ئەلمان دادەنران. لەکاتێکدا معوق و گێل و پەککەوتە و ئەوانەی لەگەل کۆمەڵگادا ناگونجێن، بەهۆی ئەوەی کاریان پێ نەدەکرا یان بەرهەمیان نەبوو بۆیە نەیاندەتوانی ببنە بەشێك لەو کۆمەڵگا پاکەی ئەمان دەیانخواست. بەپێی بایۆلۆجیای رەگەز ئەمانەش بە ئاست نزم دادەنران.هەربۆیە لە بەرچاوی نازیەکان ئەمانیش هەرەشەی ناوەوە (داخلی) بوون بۆ جەستەی دروستی نەتەوەی ئەلمان.

بەمەبەستی پاککردنەوەی کۆمەلگای ئەلمانیا و رەگەزی ئاری، نازیەکان هەزاران کەسیان گرت، لەوانەی بەبێ سود و پەککەوتەیان دادەنان. ئەمانە بەدرەوشتەکان و ئەو کەسانەشی دەگرتەوە کە دوو جار پێشنیاری کارێکی بۆ کرابوو بەلام رەتی کردبۆوە. نازیەکان کەوتنە سزادانی ئەوانەی کە کارێکی خراپیان ئەنجام دابوو ئەگەر چی ئەو کارە تاوانیش نەبوبێت بە تۆمەتی لادان لە ئایدیۆلۆجیا سزا دەدران. بەپێی ئەوەی پێی دەوترا (زانستی بایۆلۆجی تاوان) چەندین کەس کە تاوانی زۆر بچوکیان ئەنجام دابوو بەچاوێکی نزم سەیریان دەکرا. زۆر کەس لەوانە لە ئۆردوگاکاندا نەزۆك کران یان خەسێنران. ئەم کەسانەش بۆ جیاکردنەوەیان سێگۆشەیەکی رەشیان بۆ نیشانە کردبوو بە سنگیانەوە.

## ڕاونان

ئەگەر چی جولەکە تەنها ١٪ ژمارەی دانیشتوانیان پێکدەهێنا بەڵام نازیەکان تاوانباریان دەکردن کەگوایە بونەتە ئاغای ولات. بۆ ئەوەی نازیەکان بتوانن مەرامەکانیان بەجێ بێنن پێویست وابوو جولەکە لە هەموو چالاکیە کۆمەڵایەتیەکان دور بخەنەوە. ئەم پرۆسەیە لە نیسانی١٩٣٣دا بەوە دەستی پێ کرد کە حیزب و دەولەت داوایان کرد تا هەموو جۆرە پەیوەندی و کڕین و فرۆشتن لەگەڵ ئەو دوکان و بازارانەدا ببڕن کە موڵکی جولەکەن. ئەم بڕیارە زۆر لە جولەکەکانی ترساند و هانیدان تا کۆچ بکەن، بەڵام بەگشتی نەیتوانی مەرامی سەرکردەی نازیەکان وەدەست بێنێ. بەمەش تێگەیشتن کە پێویستە هۆشیارانەتر لەگەڵ جولەکەدا مامەڵە بکرێت. تێگەیشتن کە دەبێت یان ڕەزامەندی خەڵك وەربگیرێت یان هیچ نەبێت جەماوەرەکە بێ دەنگ بێت لەو ڕەفتارانەی دژی جولەکە دەکرێن.

لە نێوان سالانی ١٩٣٣ و ١٩٣٩دا نازیەکان پتر لە ٤٠٠ بڕیار و یاسایان بۆ ڕێ گرتن لە کاروکاسبی جولەکەکان دەرکرد. پرۆسەی ڕاونان و دوورخستنەوەی جولەکەکان لەئەڵمانیادا پێنج ساڵی خایاند، بەڵام لە نەمسادا پاش ئەوەی لە ساڵی ١٩٣٨دا لێکنرا بە ئەڵمانیاوە لە ماوەی شەو و ڕۆژێکدا جێبەجێ کرا. لە هەردوو وولاتەکەدا فەرمانبەرە جولەکەکان لە مامۆستا و پزیشك و پارێزەر و بازرگان کارەکانیان لە دەستداو بەمەش سەرچاوەی بژێوی ماڵ و منداڵیان نەما.[١٧] لە قوتابخانەکاندا منالانی جولەکە لە پۆل وەدەردەنران و لە زانکۆکانیشدا ڕێیان بە خوێندکارە جولەکەکان نەدەدا بچنە هۆڵی خوێندنەوە، ڕێ لە مامۆستا جولەکەکان گیرا دەرس بلێنەوە. هەزاران کەس ویستیان کۆچ بکەن و بەڵام ئەوانەش کە توانیان شوێنێکی ئارام بۆخۆیان بدۆزنەوە ناچار بوون کە هەرچی موڵك وماڵیان هەیە بەجێی بێڵن.

هەر لەگەڵ خێرابوونی پرۆسەی جوێکردنەوە و ڕاونان لە سیەکاندا زۆربەی ئەڵمانیەکان ڕەفتارەکانی نازیەکانیان قبوڵ کرد یان لە باشترین حاڵدا بێ دەنگ بوون و پرۆسەکەش بەرەو پێش چوو. . کاتێك دوور خستنەوەی جولەکە ئەڵمانی و نەمساویەکان لە ساڵی ١٩٤٠ دەستی پێ کرد و پەیوەندیە ئابوریەکان لە نێوان جولەکە و خەلکی تردا بەتەواوی پچڕا بوو. لە ئەیلولی ١٩٤١ دا و لە دوا هەنگاوەکانی یاسای جوێ کردنەوەدا، جولەکەکان ناچار کران تا لە کاتی هاتنە دەرەوەیان لە ماڵ هەریەکە ئەستێرەیەکی داودی ڕەنگ زەرد بە جلەکانیاندا هەڵواسن.

## نازیەکان وەك جەردە ڕەفتار دەکەن

قەتڵ و عام تەنها پرۆسەی لەناوبردنی جەستەیی نەبوو بەڵکو گەورەترین شاڵاوی جەردەیی نەخشە بۆ داڕێژراو بوو لە ڕاستیدا گەورەترین دزی و تاڵانی بوە لە مێژوی ئەوروپادا. لە سیەکاندا نازیەکان دەستیان گرت بەسەر زۆربەی هەرە زۆری موڵك و ماڵی جولەکەکاندا وەك خانو و خشڵ و زێڕ و کارە هونەرییەکان و هەتا بۆماوە (میرات)ی خێزانەکانیش. هێندێك لەو جولەکانەی پارەی زۆریان بانکیان هەبوو ناچاربوون زۆر کەمتر لە نرخی خۆیان بیانفرۆشن یان هەوڵ بدەن پارەکانیان بنێرنە دەرەوە و بەزۆری بۆ سویسرا.[١٨]

هەموو ئەوانەش کە دورخرانەوە یان کوژران کەل و پەل و جل و بەرگ و عەرەبانەی منالّ و پێڵاو و چاویلکەکانیشیان کۆکرانەوە و گێڕایانەوە بۆ ئەڵمانیا تا خەڵکی تر بەکاریان بێنێت.

هەتا لاشەکانیشیان بەکاردەهێنرا. قژی ژنەکان پێش خنکاندنیان بەگاز یان پاش ئەوە دەبرڕا و بۆ نموونە دەکرا بە گۆرەوی و بەتانی بۆ هێزی دەریایی. دانە ئاڵتونیەکان دەردەهاتن و دەتوێنرانەوە، هێندێك جار خۆڵەمێش و سوتوی لاشە سوتاوەکانیش وەك پەین بۆ کشتوکاڵ بەکاردەهات.

ئێستا دەزانرێت ئەو ڕاوو ڕوتە چەند قەبە بوە. هەربۆیە چەندین وڵاتی ئەوروپی لەوانە سوید، چەند لیژنەی تایبەتیان پێکهێناوە بۆ دەستنیشان کردنی ئەو شتانەی پێش جەنگ و پاش جەنگ گواستراونەتەوە بۆ وڵاتەکانیان. وڵاتی ئەڵمانیا قەرەبووی هەزاران لەو جولەکانەی کرد کە لە ڕۆژئاوادا دەژین. بەڵام ئەو جولەکانەی لە ڕۆژهەڵاتد و لە سایەی سستەمە کۆمۆنیستەکاندا دەژیان تائێستا هیچیان وەرنەگرتوە.

ئەمڕۆ سکرتێرەکەی پێشوی خۆمم چاو پێ کەوت. بە چاوە کزەکەیەوە سەیرێکی کردم و ملی وەرگێڕاو تێپەڕی. زۆر قێزم هاتەوەو تفم کردە نێو دەستەسڕەکەمەوە. پێشتر ئەو یەکێك بوو لەو نەخۆشانەی دەهاتنەلام. پاشان لەسەر جادە پێی گەیشتم، مێردەکەی بەجێی هێشتبوو بێ کار بوو پارەشی پێ نەبوو. بردمە لای خۆم و چەند ساڵێك خەریکی فێرکردنی بووم و لە عەیادەکەی خۆم دامەزراند هەتا ئەم ڕۆژانەی دوایی. ئێستا ئەو زۆر گۆڕاوە بەشێوەیەك ناتوانێت سڵاویشم لێ بکات، سڵاو لە من کە لە نێو زۆلکاودا دەرمهێنا.

لە بیرەوەریەکانی دکتۆرە هێرتا ناتهۆرف..
ڕۆژی ٩ی ئۆکتۆبەری ١٩٣٥

# تیرۆر دژی کارو کاسبی جولەکە

دوو مانگ دوای ئەوەی نازیەکان حوکمیان گرتەدەست، کەوتنە دەستنیشانکردنی شوێنی کاری جولەکەکان و زیان لێدان و پەیوەندی پچڕاندن پێیانەوە. لە نیسانی ١٩٣٣ حیزبی نازی داوای لە هەموو ئەندامانی کرد کە پەیوەندی کار و بازرگانی لەگەل جولەکەکاندا بپچڕن. هەراسان کردن بوە بەشیک لەژیانی ڕۆژانەی جولەکەکانی ئەلمانیا کە ڕۆژانە لەلایەن ئەندامانی حیزبی نازی و ئەو کەسانەوە کە سەر بە (لاوانی هیتلەر) بوون ئازار دەدران. زۆر جار لەسەر جامخانەی دوکان و شوێنی کاری جولەکەکان بە بۆیە لافیتەیان دەنوسی و داوایان دەکرد کە کەس هیچ لە جولەکە نەکڕێت. هەمان ڕەفتار لەگەل دکتۆر و پارێزەرە جولەکەکان دەکرا.

دکتۆرە (هێرتا ناتۆرف)کە پزیشکێکی جولەکەی کارا بوو لە دەفتەری بیرەوەریەکانیدا لەمانگی نیسانی ١٩٣٣ دا نوسیویەتی: ئەم ڕۆژە بەگڕ لەسەر دلم نەخشێنراوە. بۆ ئەوەی بزانیت کە ئەم کارە تا ئێستاش و لە سەدەی بیستدا ڕوو دەدات. لە بەردەم هەموو دوکانی جولەکەکان، لەبەردەم عەیادەی دکتۆرو مەکتەبی پارێزەر و پزیشکی نەشتەرگەری و لەبەردەم بالەخانەکاندا، چەند کوڕێکی گەنج یەکی لافیتەیەکیان پێیە لێی نوسراوە.. شت لە جولەکە مەکڕن. مەچنە لای پزیشکی جولەکە.ئەوەی شت لە جولەکە بکڕێت خائنە، جولەکە درۆزن و هێمای فێل و ساختەن. نوسینی سەر عەیادەی دکتۆرەکانیان بەبۆیە تێکدەدا یان دەیانشکاند. خەلکەکەش تەماشای دەکردو بە بێ دەنگی بەلایدا گوزەریان دەکرد.دیارە بیریان چوە کە لەوحەکەی من بشێوێنن، پێم وایە زۆر توند ڕەفتارم دەکرد گەر ئەو کارەیان بکردایە. پاش نیوەڕۆ بوو یەکێك لەو کوڕەگەنجانە هاتەلام بۆ مالەوە و پرسی.. ئێرە شوێنی کاری جولەکەیە؟ پێم وت ئێرە شوێنی کار نیە ئێرە عەیادەی نەشتەرگەریە.. نەخۆشی ؟ (....)

بۆ ئێوارە من و چەند هاوڕێ یەکم لە (هۆهینزولەرن دام)یەکترمان بینی سێ ژن و مێرد بووین کە هەموو پزیشك بوین. هەموو لایەك بێ هیوابوین. یەکێك لە هاوڕێکان (ئیمیل) پسپۆری چاو. ویستی دلخۆشیمان بداتەوەو وتی.. ئەمانە هەمووی پاش چەند ڕۆژێکی تر بەسەردەچن.... ئەوان نەیانزانی من بۆ هێندە توڕەم کاتێك وتم: با لەبری ئەوە بمانکوژن. زۆر چاکترە لەم مردنە دەرونیە.ئەوان دەیانەوێت ئاوا بەئازارەوە بمانکوژن.. قسەکانی من ڕاست دەرچوون.

## دروست کردنی (گیتۆکان) [19]

له سەدەکانی ناوەڕاستدا زۆربەی جولەکەکان لە گەڕەکی تایبەتدا لە شارو شارۆچکەکانی ئەوروپادا دەژیان (بەواتایەکی تر گەڕەکی تایبەت بەجولەکە هەبوون)[20] لە سەرەتای سەدەی ١٦ەوە بەو گەڕەکانە دەوترا (گیتۆ) . لەکاتی جەنگی ناپلیۆندا و لە سەرەتاکانی سەدەی ١٩دا گیتۆکانی ئەڵمانیا تێکدران.

پاش ئەوەی ئەڵمانیا لە ئەیلولی ١٩٣٩ پۆڵەندای داگیرکرد نازیەکان بەپەلە ڕایانگەیاند کە لەسەر هەموو جولەکەکانی پۆڵەندا پێویستە شوێن وماڵەکانیان جێ بهێڵن و بگوێزنەوە بۆ ئەو شوێنە تایبەتانەی بۆیان دروست کرابوو. بەمەش یەکەم گیتۆ لە سەرەتای ساڵی ١٩٤٠ دروست کرایەوە و هەر پاش ماوەیەکی کەم سەدان گیتۆی بچوك و فراوان و لە پۆڵەندا و ئەوروپای ڕۆژهەڵاتدا دروست کران.دروستکردنی ئەو ژمارە زۆرەی گیتۆ و کۆکردنەوەی جولەکەکان، هەنگاوێك بوو کە پاشان ئەنجامدانی قەتڵ و عامەکەی گەلێك ئاسان کرد.

فەرمانەکانی (هایدریخ) ی سەرۆکی بەشی ئاسایش لە SS دا کە لە٢٧ی ئەیلولی ١٩٣٩دا دەربارەی چۆنیەتی کۆکردنەوەی جولەکەکان دەریکرد[21]

دەبێت هەموو جولەکەکان لە نێو (گیتۆ)ی شارەکاندا کۆ بکرێنەوە تا چاکتر کۆنترۆڵ بکرێن و پاشان گواستنەوەیان ئاسان بێت. گرنگترین کار لەکاتی ئێستادا کۆکردنەوەو دورخستنەوەی ئەو جولەکە فرۆشیارانەیە کە لەگوندو شارۆچکەکاندان. ئەم ئەرکە دەبێت لە سێ تا چوار هەفتەی داهاتودا جێبەجێ بکرێت.

هەتا ئەو بازرگانە بچکۆلانە لە شارۆچکەکاندا بمێنن پێویستە لەگەڵ (ڤێرماخات) ڕێك بکەون لەسەر ئەو جولەکانەی کە لەو شوێنانە دەمێننەوە بۆ دابین کردنی ئازوقەی سوپا.

ئەم فەرمانانەو ڕێنماییانەی خوارەوە دەبێت پەیڕەو بکرێن:

١. چەند دەتوانرێت پەلە لە گواستنەوەی جولەکە بکرێت بۆ نێو شارەکان.

٢. دەرکردنی جولەکە لە ئەڵمانیاوە (ڕایخ) بۆ پۆڵەندا.

٣. ئەو قەرەجانەی ماون دەگوێزرێنەوە بۆ پۆڵەندا.

٤. ڕێکخستنی گواستنەوەی جولەکەکان لە خاکی ئەڵمانیاوە بەهۆی ئەو شەمەندەفەرانەی بۆ شت گواستنەوە بەکاردێن ئەنجام دەدرێت.

ڕۆژێکی هەتاوی جوان هەڵهات. شەقامەکان پڕ لە خەڵکن و بەهۆی هاتوچۆی (لیتوانیەکان)ەوە شەقامەکان داخراون (..) بەم زوانە بۆ یەکەم جار دەگوێزینەوە نێو (گیتۆ)کان. هەروەك سەدەکانی نێوەڕاست دێتە پێش چاو. ئاپۆرەی خەڵکەکە ڕەش دەچنەوە و پشتیان لە ژێر ئەو بارە قورسانەی پێیانە چەمیوەتەوە. ئێمە تێدەگەین کە بەم زوانە نۆرەی ئێمەش دێت. لە ماڵی خۆمانەوە تەماشای ئەو دیمەنە دەکەم، چ فەوزایەکە. تەماشای کۆڵ و بار و تەماشای ئەو خەڵکە داماوە دەکەم. چاو دەگێڕم بەو شتانەدا کە دەیانناسمەوەو بەشێکن لە من و ڕۆژانە بەکارم هێناون. خۆشم ویستون (....) ژنێك بەتاسەوە لە ناوەڕاستی کەل و پەلەکانیدا وەستاوە و هەر تێیان دەڕوانێ و نازانێ چیان لێ بکات. دەگری و دەست لەدەست دەدات. لەپڕێکدا هەرچی شتومەکی دەورو پشتم هەبوو دایانە قوڵپی گریان. هەموو شت دەگریان.[٢٢]

TRE VECKOR VID TYSKA FRONTER:

# Judisk karavan.

*Judarna i Kovno måste gå i bärbanan. Observera Zionsstjärnan på bröstet! Därunder: den stora judeomflyttningen i staden är i full gång samt ett talande anslag: "Den som plundrar blir skjuten".*







## ETT GHETTO SKAPAS.

Intryck från den stora judeomflyttningen i Kovno efter bolsjevikväldets fall och

**SJÄLVHÄMNDENS OHYGGLIGHETER.**

VI KORDE FRAM i ett moln av damm. I den djupa sanden på vägkanterna skramlade en oändlig rad av bondkärror, och vi mötte oupphörligt lastbilskolonner med ryska krigsfångar.

Det var inte långt från Kovno, Litauens huvudstad.

Krigets närhet hade redan börjat göra sig märkbar. Här och där voro byarna ganska illa medfarna. Det var som på de flesta andra ställen ryssarna som bränt. I något fall talade man

ed från kolliderande vagnar, från nedrasande möbler och andra saker, ett helvetiskt larm.

Alla skulle fram. Trafiken fick inte stoppa. Tiden var knapp.

Fyra dagar hade man på sig.

En kungörelse, tryckt dels på tyska och dels på litauiska, gav förklaringen till vagnarnas långa rader, till judarnas iver och böndernas brådska. Judarna, som tidigare i hög grad dominerat i Litauen och framför allt under bolsjevikregimen sett sina förut i nedgående stadda konjunktu-

*I det nya Tysklands gigantiska kamp på skilda fronter intar judefrågan en framskjuten plats, och hur man i de besatta områdena i öster löser detta problem, får man ett starkt och åskådligt intryck av i vidstående artikel — den andra i den serie skildringar av "Tre veckor vid tyska fronter", som AB:s utsände medarbetare inledde i gårdagens nummer.*

terna. Männen voro tysta och kvinnorna kunde väl prata med varandra — endast de unga flickorna skrattade och lastade

بابەتێك لە ڕۆژنامەی (ئافتۆن بولادیێت)ی ڕۆژی ١٤ی ئاب ١٩٤١ ی سویدیدا کە لایەنی نازیەکانی دەگرت، بڵاوکراوەتەوە. . (فریتز لوینگرین) کە ڕۆژنامەنوسێکی سویدی بوو مۆڵەتی تایبەتی هەبوو تا لەگەڵ هێزەکانی ئەلمانیادا بێت لەکاتی چونە پێشەوەیان. بابەتەکەی باس لە پێکهێنانی گیتۆکانی (کاوناس) دەکات لە لیتوانیا. . لوینگرین دەڵێت من تێدەگەم کە لە کاتی هاتنە پێشی سوپای ئەلمانیادا بۆچی لیتوانیەکان هێندە لەگەڵ جولەکەدا دڵ ڕەق و توند و تیژبوون. هەروەها بۆچی گیتۆیان بۆ دروست دەکردن.

ئەمڕۆ یەك شەممە ١٣ی ئۆكتۆبەر، شتێکی سەیری لەناخمدا بەجێ هێشت.ئێستا لام ڕوونە کە ١٤٠٠٠٠ سەدوچل هەزار جولەکەی خواروی وارشۆ (...) دەبێت ماڵەکانیان بەجێ بێڵن و بگوێزرێنەوە بۆ نێو (گیتۆ)

هەموو گەڕەکانی قەراغ شار لە جولەکە چۆڵکران هەروەها ١٤٠ هەزار مەسیحی دەبێت ئەو شوێنانەی نزیك گیتۆکان چۆڵ بکەن. (..) هەموو ئەو ڕۆژە خەڵکی سەرقاڵی گواستنەوەی کەل و پەلەکانیان بوون، کۆمیتەی جولەکەکان بە خەڵك دەورە درابوون و هەریەکە دەیویست بزانێت کام لەو شەقامانە هی (گیتۆ)ن.

ئیمانوئێل رینگلبلوم
مێژونووس
وارشۆ. ئۆکتۆبەری ١٩٤٠


WARSAW
1940
0
3km.
The Vistula
The Praga
Station
TO THE TREBLINKA
EXTERMINATION CAMP
VIA MALKINIA
Gdanski
Station
Umschlag-
platz
The
Wilenski
Station
The
Wschodni
Station
THE WARSAW
GHETTO
LUBLIN AND
THE MAJDANEK
EXTERMINATION
CAMP
Praga
The Glowny
Station
TO LODZ AND
THE AUSCHWITZ/
BIRKENAU EXTER-
MINATION CAMP

# ژیان لە گێتۆكاندا

یەكەم گێتۆ سالی ١٩٤٠ پێكهێنرا، لە سەرەتای سالی ١٩٤٢ دا سەدان گێتۆی بچوك و گەورە لە هەموو پۆلەندا و ئەوروپای ڕۆژهەلاتدا دروست كران. نەك تەنها جولەكەی ئەو ولاتانە بەلكو زۆربەی جولەكەكانی ئەلمانیا و نەمساش بۆ ئەم گێتۆیانە گواسترانەوە. قەرەجەكانی ئەلمانیاش هێندێك جار دەردەكران بۆ گێتۆكانی پۆلەندا. بارودۆخی ئەو گێتۆیانە گەلێك بەرەوخراپی دەچوون، دەسەلاتدارانی ئەلمانیا بڕیاریان دابوو كە بنەماكانی یاسای كۆمەلایەتی لەو گێتۆیانەدا كاریان پێ نەكرێت. بەو شێوەیە گێتۆكان بوون بە تەلەی كوشندە.

یەكێك لە فاكتەرە بەهێزەكانی ئەو بارە ناهەموارەش ئەو قەرەبالغیەی ناوگێتۆكان بوو. بۆ نمونە ئەو ژمارە خەلكەی لە گێتۆی وارشۆ خزێنرابوو نزیكەی ٤٠٠٠٠٠ چوارسەد هەزار كەس دەبوو. واتە كۆكردنەوەی خەلك لە ڕوبەرێكدا كە هەر كەس تەنها ٧,٥مەترە دوجای بەربكەوێت. هێندێك خێزان ١٥ كەس یان زیاتر لە یەك ژوردا بوون. لە زستاناندا پەیداكردنی سوتەمەنی زۆر زەحمەت بوو هەر بۆیە بەخەلوزیان دەگوت (مرواری ڕەش) بەهەمان شێوە دابینكردنی خۆراكی پێویست كارێكی زۆر گران بوو. بەم پێیەش ژیانی نێو گێتۆكان كولەمەرگی بوو.لە گێتۆی وارشۆ ئەلمانیەكان بۆ هەر كەسێك تەنها بەشی ٢٠٠ كالۆری خواردنیان بۆ دابین دەكرد (ژەمی نەخۆشێك كە پارێز بكات لە خەستەخانەكانی سویدا ١٠٠٠ كالۆریە بۆ هەر ڕۆژێك) بۆیە خواردن لە بەری (ئاری) یەكانەوە بەقاچاغ دەهاتە نێو گێتۆكانەوە تەنها بەشی مەمرەو مەژی.

ئەو كەسانەش كە خواردنی قاچاغیان پێ دەگیرا (زۆربەیان گەنج بوون) یەكسەر لەلایەن سەربازە ئەلمانیەكانەوە دەكوژران. ئەو بارە ناهەموارەش بوە هۆی بلاوبوونەوەی نەخۆشی و پەتا بەتایبەت تیفۆئید (تیفۆس).

ڕێژەی مردنی ئاسایی. زۆر لە زیادبوندا بوو، سالی ١٩٤١ پتر لە ١٠٪ خەلكی گێتۆی وارشۆ لەبەرنەخۆشی یان لەبرسان مردن.

خزمەتگوزاری پزیشكی كارێكی مەحال بوو چونكە پزیشك و سستەرە جولەكەكان هیچ كەل و پەلێكی پزیشكی یان خواردن و داو و دەرمانیان لا نەبوو.

یەکێك لە پزیشکەکان نوسیویەتی(خەلکانی لەش ساغ و بەتوانا وردە وردە لاوازو بێ هێز دەبوون هەموو خەواڵو بوون. هەر لەناو جێگادا دەمانەوەو نەیاندەتوانی هەستن نانەکەیان بخۆن یان بچن بۆتوالێت (...) دەمردن چونکە هێزیان نەبوو بچن نان بخۆن. هێندێك لەو کەسانە کە دەمردن پارچەیەك نانی بچوکیشیان لەمشتدا بوو، هیچ سەرچاوەیەك نەبوو بۆ یارمەتیدانی ئەو هەزاران هەتیوانەی لە شەقامەکاندا دەسوڕانەوەو سواڵیان دەکرد. لاشەی مردوەکان لەسەر شەقامەکان دەکەوتن تەنها بە پەڕەی ڕۆژنامەیەك دادەپۆشران، تا پاشان لە گۆڕێکی بەکۆمەلدا دەیانشاردنەوە.

لەگەل ئەو بارودۆخە ناهەموارەشدا جولەکەکان هەر هەولیان دەدا ژینی ئاسایی بەرنەسەر. قوتابخانە چوون قەدەغە بوو بەلام بەشێوەیەکی فراوان خۆیان کردبویانەوە. لە(لۆدز) نزیکەی ٦٣ قوتابخانە هەبوون کە ٢٣٣٠٠ خوێندکاری تێدا فێردەبوون. لەگەل هەموو ئەو ناهەمواریەشدا خەلکانێك هەبوون بەتایبەت گەنجەکان کە مەبەستیان بوو سەرقالی خوێندن بن وەك (دیڤید سیراکۆویاك). لە ٢٥ی مارسی ١٩٤٢دا لە بیرەوەریەکانی ڕۆژانەیدا نوسیویەتی.. زۆر نەخۆشم، دەخوێنمەوە، بەلام ناتوانم سەعی بکەم. بۆیە سەرقالی لەبەرکردنی وشەی ئینگلیزیم. لەنێو ئەوانەی دەیخوێنمەوە (شۆبنهاوەر) ە فەلسەفەو برسێتی. ئەمە چ لەیەك چونێکە!

ئەگەر چی ئەلمانیەکان پاش داگیرکردنی پۆلەندا هەزاران پەرستگای جولەکەیان سوتاند. کاری ئاینی قەدەغەکران. هەر کات جستاپۆ یان هێزەکانی ئێس ئێس شوێنێکی خواپەرستنیان پێ بزانیایە، ئەوا بەچەندین شێوە سوکایەتیان بەوانە دەکرد کە خەریکی خواپەرستی بوون.ئەگەر نەیانکوشتنایە، هیچ نەبێ ئەلمانیەکان ڕدێن (ڕیش)یان دەتاشین و یان بەزۆرناچاریان دەکردن کە میز بکەن بە تەورات و کتێبە ئاینەکانیاندا.

کتێبخانە تایبەتیەکان و کتێبفرۆشە جولەکەکانیش شوێنی گرنگ بوون کە ئەلمانیەکان دەست نیشانیان دەکردن. ئەو ئەرشیفە دەولەمەندەی مێژووی جولەکە لە ئەوروپای ڕۆژهەلاتدا کە سەدان سال بوو دامەزرا بوو دەستی بەسەرا گیراو لەنێوبرا. کاتێك ڕاگواستن لە گیتۆکانەوە سالی ١٩٤٢ دەستی پێ کرد ئەو کتێب و دەست نوسانەی لەدوایان بەجێمان هەمووی کران بە سوتەمەنی بۆ خۆ گەرم کردنەوە.

چالاکیە ڕۆشنبیریەکانی تریش وەك مۆسیقا و هونەر و شانۆ و..هتد. کە ورەی خەلکی گیتۆکانیان بەرز دەکردەوە. بۆ نمونە ئەو شانۆی منالانەی لە(لۆدیز)دا هەبوو کە شانۆی بوکە

شوشەبوو یان تیپی مۆسیقای منالآنی وارشۆ تا کاتی ڕاگواستنی خەلکی گیتۆکانیش بەرەو مەرگ هەر بەردەوام کاری هونەریان نمایش دەکرد. کۆنسێرتی مۆسیقا و نمایشی هونەری بەردەوام بوون تا مۆسیقی و ئەکتەرەکان خۆیان بەرەو مەرگ ڕاپێچکران. مێژوونوسەکان ئەم چالاکیە هونەریانە بە کاری بەرگری دەدەنە قەلەم.

خەلك هەبوون لە گیتۆکاندا کە باوەڕیان وابوو کە وا چاکە هەموو شت وەك خۆی تۆمار بکرێت تا بۆ مێژوو بمێنێتەوە. هێندێك بیرەوەریەکانی خۆیان دەنوسیەوە لەکاتێکدا چەند گروپێك بە ڕێکوپێکی سەرقالی کۆکردنەوەی بەلگەنامەو نوسین بوون دەربارەی ژیانی ڕۆژانەی خەلکی گیتۆکان و دەربارەی سیاسەتی کۆمیتە ئەلمانیەکان و هی تاکە کەسیش. لەنێو ئەو خەلکەدا مێژوونوسی وەك (ئیمانۆئیل ڕینگلبلوم) و مامۆستا چایم کاپلان لە وارشۆ و(ئاڤراهام تۆری) پارێزەر لە کۆڤنۆ (کاوناس)هەبوون.

هەر لە سەرەتاوە ئەلمانیەکان خەلکی گیتۆکانیان وەك کرێکاری سوغرە یان بەرۆژانەیەکی کەم بەکاردەهێنا. هێندێك لە دانیشتوانی گیتۆکان ڕۆلی گەورەیان بینی لە دابینکردنی خواردن و پێداویستییەکانی سوپای ئەلمانیا، هەر بۆ نمونە گیتۆی وارشۆ، لۆدز، بیالیستۆك هەموویان ئاراستە کرابوون بۆ بەرهەمهێنانی کەلوپەلی جەنگ.

هێندێك لە ئەلمانیەکان جولەکەکانیان بۆ بەرژەوەندی وخزمەت کردنی خۆیان بەکاردەهێنا، زۆربەی ئەوجولەکانەش پێیان وابوو ئەمە تاکە ڕێگایە بۆ دەربازبوون لە مەرگ. بەلام پاشان دەردەکەوت کە ئەلمانیەکان لەناوبردنی جولەکەیان لاباشترە لە بەکارهێنانیان ئەگەرچی بۆ مەرامی تایبەتی خۆشیان بوبێت.[٢٣]

## هەلبژاردنێکی مەحال (زۆر زەحمەت)

ئەلمانیەکان مەبەستیان بوو کە بەڕێوەبردنی کاروباری نێو گیتۆکان بە جولەکەکان خۆیان بسپێرن بۆ ئەم مەبەستەش لیژنە یان کۆمیتەیەکیان لە جولەکەکان پێکدەهێنا. ئەلمانیەکان خۆیان ئەم کۆمیتانەیان لە هەموو گیتۆکاندا پێکهێنا. کاری ئەم کۆمیتانە گەیاندنی فەرمانەکانی ئەلمانیا بوو بۆ خەلکی ناو گیتۆکان. ئەندامانی کۆمیتەکان لەلایەن ئەلمانیەکانەوە ناچار دەکران لە ژێر فشارو هەڕەشەی کوشتن دا کە ئەو کارانە ئەنجام بدەن. هێندێك لەو کۆمیتانە دەبوایە لیستی ناوی کرێکار

یان ئەوانەی ڕادەگوێزرێن ئامادەبکەن. لەسەر(پۆلیس)ی جولەکە پێویست بوو کە ئەوکەسانە کۆبکەنەوە کە فەرمانی ڕاگواستنیان دەردەچو، لەگەڵیاندابن تا دەیانخەنە شەمەندەفەر یان لۆریەکانەوە. ئەگەری هەڵاتن و خۆ دەربازکردن لەئارادا بوو بەڵام توندوتیژی و دڵ ڕەقی ئەلمانیەکان و ئەو ئەگەرەی زۆر زەحمەت دەکرد. بۆ نمونە ئەگەر چەند کەسێك لە گێتۆیەك هەڵبهاتنایە، ئەلمانیەکان لەبری ئەوانە سەد کەسی تری لە خەڵکەکە دەردەهێناو هەموویان دەکوشتن. لەگەڵ ئەوەشدا لە هێندێك لە گێتۆکاندا کۆمیتەکانی جولەکە هاوکاری ئەوانەیان دەکرد کە بەرگری دەکەن بەڵام لە هێندێك گێتۆی تردا ئەو کۆمیتانە ڕێگر بوون لەبەردەم هەرکارێکی لەو چەشنە. وا لێرەدا یەکێك لەو هەڵبژاردنە (اختیار)ە گرانەتان دەخەینە بەرچاو ئەویش ئەو وتەیەیە کە (جاکۆب جێنس)ی لێپرسراوی کۆمیتەی جولەکەکانی گێتۆی (ڤیلینوس) لە لیتوانیا لە ڕێکەوتی ١٥ی مایسی ١٩٤٣دا بۆ دانیشتوانی گێتۆکە کردی. بۆی باسکردن کە (جیستاپۆ) جولەکەیەکی دەستگیر کردوە کە چەکێکی کڕیوە.

هەڕەشەی کردو وتی: من تائێستا نازانم ئەو کێشەیە چۆن تەواو دەبێت. بەختمان باش بوو کە کێشە کۆنەکە کۆتایی هات، بەڵام پێتان دەڵێم گەر دووبارە ببێتەوە، زۆر بەخراپی سزامان دەدەن. ڕەنگە هەموو ئەوانەی تەمەنیان لەسەرو ٦٠ ساڵانەوەیە لەگەڵ هەموو منالەکان بەرن، ئینجا خۆتان تێ فکرن ئایا ئەو مجازەفەیە دێنێ. تەنها یەك وەڵامیش بۆ ئەم پرسیارە هەیە.. هەر کەسێك بە ژیری و بە کاملی بیر بکاتەوە. ئەو مجازەفەیە ناهێنێ !!!!!!

لە کۆتاییدا هەر بڕیارێك لەلایەن سەرکردەی دانیشتوانی گێتۆکانەوە بدرایە هیچی لە مەسەلە سەرەکیەکە نەدەگۆڕی، بەرەنگاری ئەلمانیەکانیان بکردایە یان ملکەچیان بونایە، کۆتاییەکەیان هەر هەمان شت دەبوو دەبوایە هەموو بمرن. ئەلمانیەکان بەهێز و جولەکەکانیش بێ پاڵپشت و لاواز بوون.



پاش ئەوەی لە ئەیلولی ١٩٣٩دا ئەلمانیا پولەندای داگیرکرد، فەرمانیان دەرکرد کە دەبێت هەموو جولەکەیەك ئەستێرەی داود بە بەرۆکیدا بەئاشکرا هەلواسێ، تا بناسرێتەوە کە جولەکەیە. هەر شوێنە و جۆر و ڕەنگێك بێت. ئەوەی وارشۆ ئەستێرەیەکی شین لەسەر قوماشێکی سپی کە دەبو لە قۆل بپێچرێت. ئەم پیرێژنە جولەکەیە بە ئەستێرە فرۆشتن کاسپی دەکات تا بژێوی خۆی داین بکات و نەمرێت.

ئەم وێنەیە لە ١٩ی ئەیلولی ١٩٤١دا لەلایەن (هێنریك یۆست) کە عەریفێکی سوپای ئەلمانیابوە گیراوە.

## (ئاغا و بەگ) لە ناو گیتۆدا

ژیانی گیتۆکان خۆشی و پێکەنینی کەم تیدابوو. بەڵام هێندێك جار شتی قۆشمە ڕویدەدا کە بزەیەکی دەخستە سەر لێوی ئەو خەلکە. (چاییم کاپلان) لە بیرەوەریەکانی ڕۆژی ١٥ی مایس ١٩٤٠ نوسیویەتی..

جارێکیان کابرایەکی نازی لە یەکێك لەو شوێنانەوە هاتبوو کە دەبوایە جولەکە ڕێزی زۆری هەموو سەربازێکی نازیان بگرتایە کەبەلایاندا تێپەڕیێت، بەوەی دەبوایە شەپقەکانیان بەرزبکەنەوە. ئەم جۆرە شتە لە وارشۆ پێشتر نەبوو بەڵام ئەم (میوانە بەڕێزە) دەیویست ئەو عادەتەی شوێنەکەی خۆی بەسەر ئێمەشدا بسەپێنێت. کتوپڕ هەموو جولەکەی شەقامی (کارمیلیکا) شلەژان و هاواریان دەکرد.. ئەم نازییە بێ مێشکە دەیەوێت بەلای هەرچی جولەکەیەکدا ڕەت بێت شەپقەکەی بەڕێزەوە بۆ دابگرێت. ئەمە بوە هۆی شلەژانی بارودۆخەکە و ڕاونان دەستی پێکرد، لە ئاکامدا زۆر خۆیان شاردەوە یان ڕایانکرد، زۆریش گیران و توشی تێهەلدان بوون. زۆریش دایانە قاقای پێکەنین. مندالە فێلبازەکان. کە بەڕاستی ئەوان ئاغاو گەورەی شەقامەکان بوون، هاتنی ئەو سەربازەیان بەهەل زانی و کردیانە گاڵتەبازاڕ و بەڕاستی فەرمانی نازیەکانیان بەجێ دەهێنا بەشێوەیەك ئەو زۆردارانەیان کردبوە گاڵتەجاڕی نێو بازاڕەکە بەدویاندا ڕایان دەکرد تا پێشیان دەکەوتن و ئینجا شەپقەکانیان لەسەری خۆیان دادەگرت و قاقایان لێ دەدا(١٧). هەزار و یەك جار ئەمەیان دوبارە دەکردەوە. ژمارەیەکی زۆریان لێ کۆبوبونەوە لە شەپقە لابردن وازیان نەدەهێنا و هێندێکیشان پێدەکەنین. منالێك لادەچو منالێکی تر بەسەری ڕوتی دەهاتە بەردەم نازیەکە. پێکەنین هەر تەواو نەدەبوو.




بێندزین ١٩٤٢... نەقیب. . فرانز پۆلتەر[٢٥] لە (بریسلاو) منداڵانی جولەکەی لە خۆی کۆکردۆتەوە و بەسەریاندا دەشیرێنێ: ئێوە جەنگتان دەوێ!. ئێمەش بە بێ گرنگی پێدان تەماشامان دەکرد. منداڵێکی شەش ساڵان هەنگاوی نا بەرەو ئەو وتی: نەخێر مامەی ئێس ئێس. ئێمە جەنگمان ناوێ. ئێمە هێندێك نانمان دەوێ.

ئێلا لایبەرمان شیبەر

## مردن لەسەرشەقامەکان

مەرگ لە هەموو جێیەك بوو لەنێو گێتۆدا. (ئەدینا بلادی شوایگەر) کە لە خەستەخانەی گێتۆکەی وارشۆدا سستەر بوو، وەسفی ژیانی ڕۆژانەی هاوینی ساڵی ١٩٤١ ئاوادەکات:

پاش سێ هەفتە گەڕامەوە بۆ خەستەخانە (. .) گەڕامەوە بۆ بەشی تیفۆئید بۆ لای ئەو منداڵانەی هێشتا گیانیان نەسپارد بوو. لەبەرئەوەی جێگە و قەرەوێڵە زۆر کەم بوون، زۆر جار دوو منداڵ یان سیان لەسەر یەك جێگا دەخەوێنران. هەر یەکەشیان پارچەیەك پلاستیکی بچکۆلە کە ژمارەیەکی لەسەربوو بەناوچەوانیانەوە نرابوو. هەموویان تایان لێ هاتبوو لەتاو گەرما پەیتا پەیتا داوای شتێکیان دەکرد تا بیخۆنەوە.

نەخێر ئەمانە بە تیفۆئید نەمردن. لەخەستەخانە دەرمان کردن. زۆر ماندوو بوین چونکە ڕۆژانە ژمارەیەکی زۆر منداڵی نەخۆشیان دەهێناو ئێمەش ناچاربووین کە لەجێی ئەوانە ژمارەیەك منالی ناو قاوشەکان دەرکەین یان لەبەشی گومان لێکردن (واتە گومانیان هەبوو لە تیفۆئیدەکەیان وەرگێڕ) بیانگوێزینەوە بۆ ئەو بەشەی کە دڵنیاین لەوەی تیفۆئیدیان توش بوە. سجلی تۆمارکردن لەبەشی تیفۆئید هەمیشە لەلایەن ئەڵمانیەکان خۆیانەوە دەپشکنرا. ئێمە دەرمان دەکردن تا بەڵکو لەماڵەوە لەبرسان بمرن یان بەلەش ئاوساوی بۆمان بێنەوە، بۆ هەتا هەتایە چاو لێکبنێن، ئەمە ڕۆژانە دوبارەدەبووەوە.

١٩٤٠

کانونی دوهەم — یەکەم هەوڵی ئیعدام کردن بە بەکارهێنانی گاز دژی چەند نەخۆشێکی جولەکەو خەڵکی تر جێبەجێ کرا.

نیسان_حوزەیران.. — ئەڵمانیا دانیمارك و نەرویج و بەلجیکای داگیرکرد.جولەکەکان و نزیکەی ٢٥٠٠ قەرەج نەفی کران بۆ پۆڵەندا.

نیسان.. — گیتۆی لۆدز بەتەواوی لەدنیای دەرەوە دابڕا. هیملەر فەرمانی دامەزراندنی ئۆردوگای ئاوشوێزیدا.

٣ی ئۆکتۆبەر.. — چەند بڕیارێکی تایبەت دەربارەی جولەکە لەلایەن ڤیشی فەرەنساوە.

ئۆکتۆبەر.. — هەموو جولەکەی وارشۆ خزێنرانە گیتۆوە.وە لەناوەڕاستی نۆڤەمبەردا گیتۆکە لەدنیای دەرەوە دابڕا.

١٩٤١

کانونی دوهەم.. — ناونوس کردنی جولەکەکانی هۆڵەندە.

١ی مارس.. — هیملەر ئۆردوگای ئاوشوێزی پشکنی و فەرمانیشی دەرکرد کە ئۆردوگایەك لە بیرکناو(ئاوشوێز) دروست بکرێت. ڕێگە بە کارگەی کیمیاوی (ئی.جی فارین) درا تا بەندیەکان بەکاربێنێت لەدروستکردنی کارگەیەك لە ئاوشوێز.

٢٢ی مارس.. — منالانی قەرەج و ڕەش پێستەکان ڕێیان لێ گیرا کە بچنە قوتابخانەی ئەڵمانیەکانەوە.

٣٠ی مارس.. — هیتلەر بە جەنەراڵەکانی ڕاگەیاند کە جەنگ لەگەڵ ڕوسیادا جەنگی تەفروتونا کردنە.

٢٢ی حوزەیران.. — ئەلمانیا پەلاماری یەکێتی سۆڤیەتیدا. هێزە تایبەتەکانی ئەڵمانیا قەسابخانەیان لە ڕۆژهەلاتی پۆڵەندا ئەنجامدا. هەمان ڕۆژ (ڕۆبێرت لی) کە سەرکردەیەکی نازی بوو لە وتەیەکیدا لە(بیرسلاو) ڕایگەیاند.

"جولەکەکان بە بەردەوامی دوژمنی سەرسەختی ئێمەن، چیان لەدەست هات دژی گەلەکەمان کردیان تا خۆیان حوکمڕان بن.هەربۆیە ئێمە دەجەنگین تا لەناویان دەبەین و دەبێت لەناویان بەرین.ئێمە دەمانەوێ ئازاد بین.نەك تەنها لەناوخۆدا بەڵکو لەدەرەوەشدا دەبێت ئازاد بین"

٣١ی تەموز.. مارشال هێرمان یۆرینگ فەرمانێکی ئیمزاکرد کە تیایدا دەسەڵات بە هێزەکانی ئێس. ئێس دەدات تا "چارەسەرێکی یەکجاری بۆ کێشەی جولەکە بدۆزنەوە"

١ی سێپتەمبەر.. جولەکەی ئەڵمانیا کە تەمەنیان لەسەروو شەش ساڵەوەیە دەبێت ئەستێرەیەکی داودی زەرد بکەن بە خۆیانەوە.

١٨ی سێپتەمبەر.. جولەکە دەبێت بۆ سەفەرکردنیان لەنێوان شارەکاندا.. داوای مۆڵەت پێدان بکەن.

٢٩-٣٠ سێپتەمبەر.. هێزە تایبەتەکان پتر لە ٣٣٠٠٠ جولەکەی خەڵکی (کیڤ) یان لەنزیك (بابی یار) کوشت.

١٥ی ئۆکتۆبەر.. جولەکەکان ڕێیان لێ گیرا لە ئەڵمانیاوە کۆچ بکەن.

نۆڤەمبەر.. یەکەم کۆمەڵی جولەکە بۆ (تیریسنزستاد) ڕاگوێزران. گیتۆ ئۆردوگایەکی نمونەیی بوو، وەك کۆمەڵگایەکی نوێی جولەکە وابوو، تا ئەو وەفدانەی خاچی سووری نێو دەولەتی کە دێن بیانبینن وەك چاوبەستێك بێت ئەویان پیشان بدەن.

٧ی دیسەمبەر.. یابان پەلاماری کەنداوی (پێرل)ی داو بەمەش ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا چوە جەنگەوە.

٨ی دیسەمبەر.. یەکەم کۆمەڵەی جولەکە بەبەکارهێنانی گاز لە ئۆردوگایەك لە (چیلمینۆ)ی پۆڵەندا بەرێوە چوو.

١١ی دیسەمبەر.. ئەڵمانیا جەنگی دژی ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا ڕاگەیاند.

١٢ی دیسەمبەر.. جولەکەکان بەکارهێنانی تەلەفۆنە گشتییەکانیان لێ قەدەغەکرا.

١٩٤٢

٢٠ کانونی دوهەم.. رینچارد هایدریکی سەرۆکی بەشی ئاسایش لە اس.اس.دا، سەرۆکایەتی کۆنفرانسێکی کرد کە لە (وانسی) ی قەراغ شاری بەرلین

سازدرا. ژمارەیەکی زۆر لە گەورە دەرەجەدارانی نازی و لێپرسراوانی حکومەت ئامادەی بوون و بەمەبەستی هاوکاری کردنی یەکتر بۆ دۆزینەوەی "چارەسەری بنەڕەتی".. ڕاگواستنی جولەکەو قەرەج لە گێتۆی (لۆدز)ەوە بۆ (چێلمنۆ) بەردەوام بوو.

| | |
|---|---|
| ١٥ی شوبات. . | باری یەك شەمەندەفەر لە جولەکە بەبەکارهێنانی گازی (زیکلۆن. ب) لە ئاوشویز کوژران. جولەکەکان، ڕاگرتنی گیانداری ماڵی یان لێ قەدەغەکرا. |
| ١٧مارس. | یەکەم کۆمەڵکوژی بەهۆی گازەوە لە ئۆردوگای (بلزاك) خواروی ڕۆژهەڵاتی لۆبلین جێبەجێ کرا. |
| ٢٠ مارس. . | ژووری گاز، لە (ئاوشویز بیرکاو) کەوتەکار. دوو خانوی لادێ بۆ ئەو مەبەستە چاك کرابوون. جولەکەی پۆڵەندی (ئەپەر سیلیزیا) یەکەم کۆمەڵەی قوربانیەکان بوون. |
| نیسان و مایس. . | ئۆردوگای کۆمەڵکوژی (سۆبیبۆر) کرایەوە. |
| ٤مایس. . | یەکەم هەڵبژاردن لە نێو ئۆردوگای ئاوشویز بیرکاو دەستی پێ کرد. بۆ ماوەی چەند مانگێك هەر بەندکراوێك "نەتوانێ کاربکات" دەنێردرێت بۆ ژووری گاز. |
| ١٢مایس. . | جولەکەکانی ئەڵمانیا چیتر بۆیان نیە بچنە لای سەرتاشە ئاریەکان. |
| مایس، حوزەیران. . | جولەکەکانی ئەوروپای ڕۆژئاوا دەبێت ئەستێرەکەی داود بکەن بەخۆیاندا. |
| ١٢حوزەیران. . | جولەکەکانی ئەڵمانیا دەبێت هەموو ئەو ئامێری ڕادیۆو ئامێری پاسکیل و ئامێری چاپەمەنیانەی هەیانە تەسلیم بە دەوڵەتی بکەن. |
| ١ تەموز. . | منالآنی جولەکەی ئەڵمانیا ڕێگای چونە قوتابخانەی جولەکەکانیان لێ قەدەغەکرا. |
| ٤تەموز. . | یەکەم "هەڵبژاردن، جیاکردنەوە"لە ئاوشویز بەڕێوە چوو. لەسەر تەختایی شوێنی بارداگرتنی شەمەندەفەرەکە. شەمەندەفەرەکە جولەکەی سلۆڤاکیای تێدا بارکرابوو. |
| ٧ تموز. | هنریك هیملەر، لەگەڵ پرۆفیسۆر (کارل کلاوبێرگ) و ئەوانی تردا چۆنیەتی نەزۆك کردنی ژنە جولەکەکانیان تاووتوێ کرد. هیلمەر بە (کارل)ی وت کە ئۆردوگای ئاوشویز لەبەردەستی دایە تا تاقی کردنەوە لەسەر بەندکراوەکان ئەنجام بدات. |

١٠ تەموز . . به (كلاوبێرگ) یان ڕاگەیاند كه هیملەر داوا دەكات تا بچێت بۆ (ڕاڤینزبروك) بۆ نەزۆك كردنی ژنه جولەكەكان. هیملەر مەبەستی بوو بزانێت، كه نەزۆك كردنی هەزار ژنه جولەكه چەند دەخایەنێت.

١٥–١٦تەموز . . یەكەم شەمەندەفەر له جولەكەكانی هۆڵەندا گەیشتنه ئاوشوێز.

١٦–١٨تەموز. پۆلیسی فەرەنسا ١٣٠٠٠ جولەكەی بێ وڵات له پاریس دەستگیردەكات. كه ٩٠٠٠ یان لەنێویاندا ٤٠٠٠ منداڵی تێدابوو بۆ ئاوشوێز ڕاگوێزران.

١٩ تەموز . . هیملەر فەرمانی دەركرد كه دەبێت هەموو جولەكەی پۆڵەندا تاكۆتایی ساڵ لەناوبرابن.

٣٠ تەموز . . دەبێت ڕێكخراوە جولەكەكان هەموو ئەو شتە كەلتوریانەی له كانزای بەنرخ دروستكراون تەسلیمی بكەن.

٢٢ تەموز– ١٢ ئەیلول جولەكەكانی گیتۆی وارشۆ بەكۆمەڵ ڕاگوێزران بۆ ئۆردوگای مەرگی (ترێبلینكا) .

٩ ی تشرینی ١ . . جولەكەكانی ئەڵمانیا بۆیان نیه له كتێبخانەكانی (ئاری)یەكان شت بكڕن.

٢٦ تشرین ٢ . . جولەكەكانی نەرویج بۆ ئاوشوێز ڕاگوێزران.

١٧ كانونی ١ . . هاوپەیمانەكان ڕایانگەیاند كه هەركەس دەستی هەبێت لەكوشتاری جولەكەدا پاش جەنگ سزا دەدرێت.

## ئەو ڕێنماییانەی بۆ هێزەکانی پۆلیس لە (سار و ئەلزاس) دەرکران

١ . تەنها جولەکەی ڕاستەقینە ڕادەگوێزرێت. (میشلینج)ئەو کەسانەی دوورەگن، هەروەها جولەکە بێگانەکان ئەوانەی خەڵکی یەکێك لە وڵاتە دوژمنەکان نین یان خەڵکی ئەو شوێنانە نین کە لە ژێر دەسەڵاتی خۆماندایە و ئەم پرۆسەیە (واتە پرۆسەی ڕاگواستن \ وەرگێڕ) نایانگرێتەوە. ئەو جولەکانەش کە وڵاتیان نیە وەك کارێکی مەبدەئی دەگیرێن. هەموو جولەکەکان ڕاگواستن دەیانگرێتەوە، تەنها ئەوانە نەبێت کە لەجیێدا کەوتوون.

٢ .خاڵەکانی کۆکردنەوە لە (لودویگس هافێن)، (کایسەر سلاوتن) و (لانداو) ئامادەکراون بۆ کۆکردنەوەی جولەکەکان. ئەوانەی کەدەگیرێن دەبێت بە پاس بگوێزرێنەوە بۆ ئەوێ. لێپرسراوێکی ڕەسمی بۆ هەرپاسێك دادەنرێت، ئەگەر پێویستی کرد پۆلیس یان فەرمانبەرێك بۆ هاوکاری کردنی دادەنرێت.

٣ .هەموو لێپرسراوێکی گواستنەوە، لە شوێنی کۆکردنەوە لیستێکی دەدرێتێ، لەو لیستەیەدا ناوی گواستراوەکان و ئەو پۆلیس و فەرمانبەرەش دیاری دەکرێت کە هاوکاری دەکەن، هەروەها ناوو ئەدرێسی ئەو بەندکراوانەش کە دەبێت بگیرێن.

(...)

٥ . دوای ئەوەی لێپرسراوەکان زانیاری تایبەت دەربارەی جولەکە بەندکراوەکان وەردەگرن، بەرەو شوێنی دانیشتنیان دەکەونەڕێ. پێیان ڕادەگەیێنن کە بەمەبەستی ڕاگواستن دەیانگرن و پێویستە لەماوەی دوو سەعاتدا ئامادەبن. هەر ڕوداوێك ڕویدا دەبێت لێپرساوی خاڵی کۆکردنەوە ئاگاداربکرێت تا ڕێنمایی پێویست بدات لەوبارەیەوە. ماوەی خۆ ئامادەکردن بەهیچ جۆرێك دواناخرێت.

٦ . بۆئەوانەی دەگیرێن، ئەگەر پێویست بوو دەتوانن ئەم شتانە لەگەڵ خۆیاندا بهێنن:

ا . بۆ هەر جولەکەیەك جانتایەك یان کیسەیەك کە شتەتایبەتیەکانی تێدابێت، هەرکەسێکی کامڵ بۆی هەیە تەنها ٥٠ کیلۆی پێ بێت، بۆمنداڵ ٣٠ کیلۆ.

ب . قاتێك جلی تەواو.

ج. هەرجولەکەیەو بەتانیەکی خوری.

د . خۆراکی چەند ڕۆژێك.

هـ.چەتاڵ و کەوچك و قاپێك.

و.پارە هەریەکە تەنها ١٠٠ مارك(ار.ام)

ز.پاسپۆرت و کارتی ناسنامە (هویە)یان هەرناسنامەیەکی تر. بەمەرجێك نابێت لەناو شتەکاندا بپێچرێتەوە بەڵکو دەبێت بەکەسەکە بێت.

٧.ئەم شتانە نابێت لەگەڵ خۆیان ببەن: دەفتەری بانك و چەکی پارە و خشڵ وە پارەش بە بری دیاریکراو کە بریتی بێت لە ١٠٠ مارك.

(...)

٩.پێش ئەوەی ماڵەکەیان بەجێ بێڵن دەبێت ئەم شتانە ئەنجام بدرێت:

ا.هەموو ئاژەڵ وگیاندارە ماڵیەکان (سەگ، پشیلە، باڵندە) پێویستە تەسلیم بەسەرۆکی شارەوانی، کۆمیتەکان، سەرۆکی لقەکان، سەرۆکی جوتیارانی ناوچەکە، یان هەر بەرپرسێکی تری ئەو ناوچەیە بکرێت و وەسڵێکی لێ وەربگیرێت.

ب.خواردنی تەڕە (تازە) دەبێت تەسلیم بە لێپرسراوی NSV (مەکتەبی خۆش گوزەرانی کۆمەڵایەتی تایبەت بە حیزبی نازی) بکرێت.

ج.ئاگرەکان دەبێت بکوژێنرێنەوە.

د.ئاوو گاز دەبێت بگیرێنەوە.

هـ.فیوزە کارەباییەکان دەبێت دەربهێنرێن.

و.کلیلەکانی ماڵەکە پێکەوە گرێ دەدرێت و ناوی خاوەنەکە، شار، دێ و شەقام و ژمارەی خانوەکەی لەسەر دەنوسرێت.

ز.ئەوانەی دەگیرێن پێش گواستنەوەیان پێویستە یەکسەر بپشکنرێن نەك چەك یان تەقەمەنی یان ژەهر یان پارەی بیانی و خشڵ و ئاڵتون...هتد یان پێ بێت.

(..)

١٣. پێویستە لەکاتی گرتنی جولەکەکاندا بە باشی هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا بکرێت، نابێت بەهیچ جۆرێك توندو تیژی و ڕیسواکردن ئەنجام بدرێت.

# ڕاگواستن . .

کوشتن و قەتڵ و عامی ئەو ژمارە زۆرەی جولەکە هەرگیز سەرکەوتوو نەدەبوو گەر بەو شێوە بەکۆمەڵە ڕانەگوێزرانایە ، کە ملیۆنەها جولەکەی ئەوروپا ڕاگوێزران. لەبەرچەند هۆیەك دەسەڵاتدارانی نازی بڕیارياندا کە هەموو ئەو جولەکانەی دەگیرێن نابێت لەو وڵاتانەدا بکوژرێن کە لەژێر دەسەڵاتیاندایە ، بەڵکو دەبێت هەموويان بگوێزرێنەوە بۆ ئۆردوگاکانی مەرگ کە بەتايبەتی بۆ ئەو مەبەستە لە پۆڵەندا دروست کرابوون. یەکێك لە گرنگترین ئەو هۆيانە ئەوەبوو کە هیتلەر و دەسەڵاتدارانی نازی لایان ڕوون بوو کە پێویستە ئەو قەتڵ و عامە بەنهێنی ئەنجام بدرێت. نازیەکان ترسی ئەوەيان هەبوو گەر ئەو کوشتارە بەکۆمەڵانە لە ناوەراست و ڕۆژئاوا و سەروی ئەوروپادا ئەنجام بدرێن، ڕەنگە هاوکاری و پەیوەندی خەڵك و دەسەڵاتدارانی ئەو شوێنانە لەدەست بدەن. لەهەندێك شوێنی پۆڵەندا ، یەکێتی سۆڤیەت، و وڵاتانی بەلتیك، ژمارەيەکی زۆر بەکۆمەڵ نزيك ماڵەکانی خۆیان کوژران. پاشان نازیەکان هەستيان کرد کە وا چاکترە کە ئەو جولەکانە لە ناوچەکانی خۆياندا نەکوژرێن بەڵکو بگوێزرێنەوە بۆ ئۆردوگاکان.

ئەو تۆڕی هێڵی شەمەندەفەرە پێشکەوتوانەی هەموو ئەوروپای پێکەوە بەستبوو، ڕاگواستنی ئەوخەڵکەی لە سەرانسەری ئەوروپاوە بۆ پۆڵەندا گەلێك ئاسان کرد .لەوێش ملیۆنەها ئينسان بێ سەروشوێن کران.

ئەگەر ئەو ملیۆنەها جولەکەیەی بۆ (ئاوشویز بیرکناو) ڕاگوێزران و بە گاز کۆمەڵکوژ نەکرانایە ، ئەوا ئەو شوێنە بچکۆلەيە ڕەنگە ببوایە بە یەکێك لەشارە هەرەگەورەکانی ئەوروپا .

لە تشرینی ١ ی ١٩٤٠دا ٧٥٠٠ جولەکە لە (بادن و سار)ەوە گواسترانەوە بۆ ئۆردوگایەك لە خواروی فەرەنسا. پاشان زۆربەیان لە فەرەنساوە گواسترانەوە بۆ پۆڵەندا. یەکێك لەو کەسانە پیاوێکی پیری تەمەن ٩٧ ساڵانی خەڵکی (کارل سروە) بوو.. ئەو خەڵکانەی ڕادەگوێزران تەنها ١٥ دەقیقە تا دوو سەعات مۆڵەتیان هەبوو تا ماڵەکانیان بەجێ بێڵن.. یەکێك لەو پۆلیسانەی سەرپەرشتی ئەو کارەیان دەکرد نوسیویەتی "هەندێك لەو خەڵکانە لەو کاتانەدا بە خۆکوشتن خۆی لە ڕاگواستن ڕزگار دەکرد.



٢٥ نیسان ١٩٤٢ دیمەنی ڕاگواستنی ٩٩٥ جولەکەی خەڵکی (ووڕزبۆرگ) لەئەڵمانیا ، لەژێر چاودێری پۆلیس و سوپادا . ناچار کران ماڵ و موڵك و کەل و پەلەکانیان جێ بهێڵن و تەنها مۆڵەتی ئەوەیان پێ درا کە "ئەو شتانە بێنن کە زۆر پێویستن" . لە وێستگەی شەمەندەفەری (ووڕزبۆرگ)یش ناچار کران تا هێندێکی تر لەو کەل و پەلانەی پێیان بوو بەجێی بێڵن. ئەو جولەکانە سەرەتا گواسترانەوە بۆ ئۆردوگا کاتییەکانی (تراونیکی) و (ئیزبیکا) لە خوارووی ڕۆژهەڵاتی پۆڵەندا ، پاشان بۆ ئۆردوگای مەرگ لە (بلزاك) .

## ئومشلاگ پلاتز

ئومشلاگ پلاتز بەو شوێنانە دەوترا یان بەو پانتاییە فراوانە دەوترا وەك (ساحەكانی ناوشار یان شوێنێكی فراوان و كراوە) كە لە گێتۆكاندا بۆ كۆكردنەوەی ئەوخەلكانە بەكاردەهات كە رەوانەی مەرگ دەكران. لە گێتۆگەورەكاندا زۆرجار ئەم ساحانە نزیك وێستگەی شەمەندەفەر بوون. لە گێتۆ بچكۆلەكانیشدا ئەوساحانە بۆ كۆكردنەوەی جولەكەكان بەكاردەهات و لەوێدا ئەڵمانیەكان بڕیاریان دەدا كێ هەڵبژێرن بۆ ڕاگواستن بۆ مەرگ و كێ بهێڵرێتەوە بۆ ئیش كردن. لە وارشۆ، بەمەبەستی ئاسان كردنی ڕاگواستن هێڵێكی شەمەندەفەری زیادە دروستكرا بۆ بەستنەوەی ئومشلاگ پلاتز بە وێستگەی شەمەندەفەری سەرەكییەوە.

ڕاگواستنی بەكۆمەڵ لە وارشۆ وە بۆ (تریبلینكا) ڕۆژی ٢٣ تەموزی ١٩٤٢ دەستی پێ كرد. هەموو ڕۆژانی هەفتە هەزاران جولەكە لە ساحەی گێتۆكاندا ڕیز دەكران. ڕۆژانە ٦٠٠٠ تا ٧٠٠٠ جولەكە دەبوو ڕاگوێزرێت. هەموو شەقام و كۆڵانەكان دەگیران، زۆربەی جولەكەكان بەر ئەوشاڵاوانە دەكەوتن و دەگیران. هێزەكانی ئێس. ئێس. بەهاوكاری و یارمەتی سەربازانی لاتیڤیا، لیتوانیا و ئۆكرانیا خەڵكەكەیان دەستگیردەكرد. ئەو پۆلیسە جولەكانەی لەگێتۆكانیشدا بوون ناچاردەكران تا بەشداری لەو شاڵاوی گرتنانەدا بكەن. زۆر لە جولەكەكان خۆیان بەوە هەڵدەخەڵەتاند كە بەڵێن وایە لە ئومشلاگ پلاتز نانیان بدەنێ.

لە ٥ یان ٦ی مانگی ئابدا (جانیوس كۆركزاك) كە دكتۆر و زانایەكی پەروەردەی ناسراوبوو، لەگەڵ ٢٠٠ منالی هەتیوی بێ دایك وباوكی ئەو خانەی هەتیوانەی خۆی بەڕێوەبەری بوو، بەرەو (ترێبلینكا) ڕادەگوێزران. مۆڵەتیان بەخۆی دا تا خۆی دەربازبكات بەوەی بپەڕێتەوە ئەو بەشەی وارشۆ كە (ئاری) نشین بوو. بەڵام ئەم ئەو فرسەتی خۆدەربازكردنەی ڕەت كردەوە. (كورزاك) پاشان لە ڕێگای ئوشملاگ پلاتز بینرا منداڵێكی لەباوەش گرتبوو و دەستی منالێكی تریشی گرتبوو و لەپێش منداڵەكانەوە بەرەو ئومشلاگ پلاتز دەڕۆیشت. كۆرزاك پێشەوایەتی ئەو ڕیزە منداڵە بێ دایك و باوكانەی دەكرد كە بەرەو مەرگ ڕادەگوێزران.

تا ناوەڕاستی ئەیلولی ١٩٤٢ پتر لە ٢٦٠٠٠٠ دووسەد و شەست هەزار ژن و مندالْ لە ئومشلاگ پلاتزەوە بەرەو ترێبلینكا و ئۆردوگاكانی تر ڕاگوێزران. دوا وەجبەی ڕاگواستن لەگەڵ ئەو ڕاپەڕینەی گێتۆكەی وارشۆدا بوو كە لە كانونی دوهەمی ١٩٤٣ دا ڕویدا. پاش ئەوەی ئەو هەڵچونە تێك و پێك شكێنرا هیچ جولەكەیەك لە وارشۆدا نەمابوو.



کۆمەڵێك ژن ومندال لە ئومشلاگ پلاتزی وارشۆ، چاوڕێی ڕاگواستن دەکەن بۆ ترێبلینکا
کانونی دوهەمی ١٩٤٣.

شوێنێك لە خوێن و فرمێسك

زۆرجار ئەو خەلكانە لەبەر سەرماو گەرمادا چەند رۆژێك رادەگیران یان رادەوەستان و چاوەڕێی ئەو شەمەندەفەرانەیان دەکرد کە خواردنیان دەهێنا. زۆر لەو بەلگەو شایەتانەی ئەو بارودۆخە ناهەموارەی ئەو مەرگەساتە کۆکرانەوە، لەوانە.. هێلینا بیرینباوم لە قەتل و عام و لە ئومشلاگ پلاتزی وارشۆ رزگاری بوو بوو ئەمەش ئەو دیمەنانەیە کە بەچاوی خۆی دیویەتی:

*"دیسان بردیانینەوە بۆ ئومشلاگ. سەری سەدەمین جارە لەو ئومشلاگە نەعلەتیە کۆمان بکەنەوە کە بەخوێن و فرمێسك تەڕ بوە، لورەی ئەو شەمەندەفەرانەی تێدەپەڕن و سەدان هەزار جولەکە بەرەو کۆتایی ژین راپێچ دەکەن گوێچکەمانی پڕ کردوە."*

لە ساحەیەکی نزیك بینایەکدا کە پێش جەنگ خوێندنگا بوو. پڕ بوو لە خەلکی بێ هیواو نەگبەت. زۆربەیان لەوانە بوون کە پێشتر لە کارگەکانی ناوچەی (ئاری)یەکاندا کاریان کردبوو. هەموویان (*Ausweis*) ناسنامەیان پێ بوو، کە ماوەیەکی کەم پێش ئێستا "مافی ژیانیان هەبوو". ئەمرۆ پاش ئەوەی وەك رۆژانی تر لەکار دەگەڕانەوە بۆمالەوە، هەر وەکو رۆژانی پێشوو شەقامەکان پڕ بون لەو سەربازانەی هەر لە شوێنی کارەوە تا مالی خۆیان چاودێرییان دەکردن، بەلام ئەمرۆ هەموویان توشی شالاوێکی گرتن هاتن.

*بەهۆی ئەو پۆلیسانەوە کە دیوارێکیان دروستکرد بوو (ژمارەیەکی کەم نازییان تێدا بوو) هەموویان چەکدار بوون. رێی چونە نێو گێتۆکانیان و شوێنی خۆحەشاردانیان لێ گرتبوین. براگەورەکەم و پورم و کچەکەی تا ئەو کاتە لەناو گێتۆکەدا مابوون و چونکە ئەو رۆژە لەگەل ئێمە نەهاتنە دەرەوە. بەویەری بیر ئالۆزیەوە چاوەڕێ بووین بزانین دواتر چی رووەدات و تەماشای دەوروبەرمان دەکرد و بۆ رێگایەك دەگەڕاین کە دەرباز بین. باوکم بەجێی نەدەهێشتین، دایکم و براکەم و منی ماچ دەکرد. توند دەستی گرتبوین و نەیدەهێشت یەك هەنگاو لێی دوور کەوینەوەو بەتایبەت دایکم کە توند رایدەکێشاین تا لەو حەشاماتە دورمان بخاتەوە.*

نیازی وابوو بمانباتە ناو بینای خوێندنگاکەوە، کە لەوێ شوێنی فریاکەوتنی سەرەتایی لێ بوو. پۆلیسی جولەکە بوون. دەیویست بمانشارێتەوەو نەخرێینە ناو شەمەندەفەرەکەوە.

باوکم هێندە دەترسا و شلەژا بوو کە نەیدەتوانی بیر لە دەربازبوونیش بکاتەوە. هەر ئەوەندەی دەسەڵات بوو پاسپۆرتەکەی پیشانی هیتلەرییەکان بدات و وایدەزانی بەوە رزگاری دەبێت. دەترسا و وایدەزانی تەنها بە شکاندنی فەرمانەکانیان تیادەچین و گەر بە دڵی ئەوان هەڵسوکەوت بکات رزگارمان دەبێت.

دایکم وەك باوکم نەبوو. هەر بۆیە من خۆم بەودا هەڵدەواسی، پێم وابوو ئەو دەتوانێ شوێنێکمان بۆ بدۆزێتەوەو لەو وەزعە خراپە رزگارمان بکات. کە لەگەڵ باوکمدا دەبووم هەستێکی تەواو جیاوازم هەبوو.

هەرگیز پێش ئەمڕۆ سەیارەی شت هێنان لەم کاتانەدا کۆنەکراونەتەوە. بۆیە پێمان وابوو دەبێ هەموو شەوەکە لە ئۆمشلاگ بەسەربەرین تا شەمەندەفەرەکەی بەیانی دەگات. بەمەش هیوای دەربازبونمان هەبوو تا بگەڕێینەوە ناو گێتۆ و ژوری حەشارگەکە.

بەڵام لەپڕ چاومان لێ بوو نازیەکان ڕەشاشەکانیان لە ناوەڕاستی ساحەکەدا دامەزراند و ڕویان کردە ئەو خەڵکە زۆرەی لەترساندا دەیانلاواندەوە. ئەگەر چی هەموو دەیانزانی کەچی ڕوو دەدات و بەڵام کەس نەگریا یان دەنگی گریانی لێ بەرز نەبۆوە. بێدەنگیەکی ترسناك باڵی کێشا و باوەشمان کردبوو بەیەکتریدا و دایك و باوکم، (هیلیك) و من، هەر سەیری یەکتریمان دەکرد بە جۆرێك کە وەك بۆ دواجار تەماشای یەکتر بکەین. وەك ئەوەی بمانەوێت وێنەی یەکتر لەگەڵ خۆمان بەرین پێش ئەوەی بەتەواوی تاریك ببێت.

هەموو شتێك، هەموو ئەو شتانەی هەوڵمان بۆدا و لەگەڵیاندا ژیاین و لەگەڵ خۆماندا تەواو دەبن.

باوکم نیوە هۆش بوو و دایکم هەر وەك خۆی ئارام بوو، بۆمان پێدەکەنی "چرپاندنی بەگوێمدا، مەترسە! هەموو کەس دەبێت بمرێت. ئێمەش دەمرین، پێکەوە دەمرین، بۆیە مەترسە، هێندە ترسناك نیە...



ئەمە وێنەی بەشێك لە ئومشلاگ پلاتزی وارشۆیە . پیاوەکان لەلای چەپی وێنەکەو ژن و مندال لەلای ڕاست و بە سەربازی ئەلمانی نێوانیان گیراوە ، هەموو چاوەڕێی ڕاگواستن دەکەن بۆ ترێبلینکا ، بیناکەی لای چەپ وەك خەستەخانە بەکاردەهات هەروەها ژووری تایبەتی تێدابوو بۆ ئەو کەسانەی بۆ مەرگ ڕاپێچ دەکران. بیناکەی لای ڕاست، بارەگای سەرکردایەتی (جستاپۆ) بوو لە ئومشلاگ پلاتز. هەردوو بیناکە تا ئێستا ماون.

"لە حوزەیرانی ١٩٣٦ ئەنجامدانی یاریە ئۆلۆمپییەکان لە بەرلین بوو بەبیانویەك تا سەدان قەرەج خۆیان و خێزان و ئەو کەل و وپەل و عەرەبانەو ئەسپ و هەموو ئەو شتانەی تر کە پێیان بوو ڕاگوێزرێن بۆ (مارزاهن) واتە شوێنی حەوانەوە کە دەکەوتە نێوان سەرقەبرانێك لەلایەك و زبلدانێك لەلایەکەی ترەوە. هەرپاش ماوەیەکی کەم ئەو شوێنی حەوانەوەیە بە تەلبەند دەوری گیرا. ئۆردوگای قەرەجە ڕاگوێزراوەکان لە گەڕەکێکی قەراغ شاری بەرلین دروستکرا بوو. هەر لەو شوێنی حەوانەوانە و لە گرتوخانەکانی تری وەك ئەو کە لە نزیك شارەکانی ئەلمانیاوە بۆ قەرەج دروستکرا بوو. پاش چەند سالێك هەزاران قەرەج بەرەو ئۆردوگاکانی مەرگ لە ڕۆژهەلات ڕاپێچکران."

## ڕاگواستنی قەرەجەکان

ڕاوەدونانی قەرەجەکان چەند بیانوی ئایدیۆلۆژی بۆ دەهێنرایەوە.چونکە هنریك هێملەری سەرۆکی ئیس. ئیس. باوەڕی وابوو کە هێندێك لەو قەرەجانە لە ڕەگەز و ڕەچەلەکی خاوێنن و (ئامۆزای ئاری)یەکانن. بۆیە پێویست وایە کە پارێزگاریان لێ بکرێت و بناسرێن. لە ڕاستیدا ئەرکی سەرەکی ئەوانەی پێیان دەوترا "لێکۆڵەرەوانی ڕەگەز" لەسەرەتادا دیاری کردن و جیاکردنەوەی ئەو قەرەجە ڕەگەز خاوێنانە بوو لەو قەرەجانەی کە دوو ڕەگن "دووخوێنن"و جیاکردنەوەی ئەو دوو ڕەگانە بوو لە ئاریە خاوێنەکان کە پاشان زۆربەیان بەدووڕەگ دانران[٢٦]. ئەگەر یەکێك لەو ڕەگەز پاکانەش بکەوتایە نێو ئەوانەی بەدوو ڕەگ دانرابوون ئەوا بەهۆی بیرۆکراتیەتی ئەلمانیای نازییەوە ئەویش تێوەدەگلا. زۆربەی قەرەجەکان تالآوی ڕاگواستنیان نۆشی. هێندێك لەوانە لەسەرەتادا بۆ گێتۆی جولەکەکان و لەوێشەوە بۆ ئۆردوگاکانی مەرگ ڕاگوێزران. ئەو تاقیکردنەوە بەد ناوانەی لە ئاوشویز ئەنجام دەدران تەنها بەسەر منداڵانی جولەکەدا نەدەکرا بەڵکو لەسەر منداڵانی قەرەجیش دەکران. پتر لە ٢٠,٠٠٠ قەرەج لەوێدا کوژران.

لە ئەوروپای ڕۆژهەڵاتدا کوشتنی قەرەجەکان بەکۆمەل لەناو ئەو دارستانانەی قەراغ شار و شارۆچکەکاندا کارێکی زۆر ئاسایی بوو زۆرجار لەلایەن خەلکی ناوچەکەوە ئەنجام دەدرا. لە کرواتیادا قەرەجیان بەتەواوی قەلاچۆ کرد. ژمارەی ئەو قەرەجانەی لەلایەن نازیەکان و هاوکاریانەوە کوژران تا ئێستا نەزانراوە و ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی تائێستا بەدواداچوونی تەواو بۆ ئەو مەسەلەیە ئەنجام نەدراوەو هەروەها نەبوونی سەرچاوەو تائێستاش بەتەواوی ژمارە و قەبارەی دانیشتوانی قەرەج پێش جەنگ و پاش جەنگ دیارنیە[٢٧] کەمترین ژمارە کە لەلایەن مێژووناسانەوە دیاریکراوە ٢٠٠,٠٠٠ کەسە و هێندێك مێژونوسیش پێیان وایە نزیکەی ٦٠٠,٠٠٠ پیاو و منال و ژنی قەرەج قەتل و عام کراون. ئەوەی کە دیارە ئەوەیە کە نزیکەی ١٠تا٥٠ ٪ی هەموو قەرەجی ئەوروپا گیانیان لەدەستدا. بە پێچەوانەی جولەکەکانەوە تا ئێستا هیچ کام لەو قەرەجانەی لەپاش جەنگ ڕزگاریان بوو قەرەبوو نەکراون، نە لە لایەن ئەلمانیا و نە لە لایەن هیچ وڵاتێکی ترەوە. لە ئەوروپادا و بەهۆی زیادبوونی مەسەلە نەتەوایەتیەکان، تا ئێستا قەرەج لە هەموو گروپ و ڕەگەزەکانی تر پتر توشی جیاخوازی دەبن و زۆر جاریش دەچەوسێنرێنەوەو ئازاردەدرێن.



رۆبێرت ریتەر یەکێك بوو لە شارەزاکانی نازی لە بواری "ئازاردانی قەرەج دا" و (ئیڤا یوستین) یەکێك بوو لە یارمەتیدەرەکانی، ریتەر لە بنەڕەتدا پسپۆر بوو لە بواری سایکۆلۆژیەتی منال و بەتایبەتی (بایۆلۆژیای تاوانکاران) بەبۆچوونی ئەوان تاوانکاری و لادان دەگەڕێتەوە بۆ ڕەگەز و بۆ ماوەی بایۆلۆژی. ریتەر دەیگوت کە قەرەجەکان لە سەرەتادا ڕەگەزی ئاری خاوێن بوون، بەڵام ئەو سیفاتە چاکانەیان هەموو لە دەستداوە ئەویش بەهۆی زاووزێ و تێکەڵاوبوون لەگەڵ ئەو نەتەوانەی تر کە لە ئاستی نزمدان. ئەمەش بەبۆچوونی ریتەر بۆتە هۆی تاوانکاری و لادانیان لە ڕەوشتە کۆمەڵایەتیەکان. ئیڤا جوستین لەکاتێکدا یارمەتیدەری ریتەر بوو بۆ خۆی تاقیکردنەوەی سەربەخۆی ئەنجام دەداو بۆ ئەم مەبەستەش ٣٩ منالی قەرەج لە یەکێك لە خانەی منداڵانی کاتۆلیکدا کۆکرابونەوە تا ئیڤا بتوانێت کارەکەی خۆی لەسەریان تەواو بکات، . کاتێك لە حوزەیرانی ١٩٤٤دا لێکۆڵینەوەکەی کۆتایی هات. منداڵەکان هەمویان گواسترابونەوە بۆ ئاوشویز بیرکناو و خرابونە ئەو شوێنەی کە پێی دەگوترا ئۆردوگای قەرەج. پاشان هەموو ئەو منالانە لەگەڵ ٢٩٠٠ قەرەجی تر لە شەوی ٣ی نیسان ١٩٤٤دا و بە بەکارهێنانی ژووری گاز کوژران.

ڕیتەر هەموو شتێکی ڕێك و ئاسان کردبوو. یەك دوای یەك دەهاتنە ژورێ و لەسەر کورسیەکە دادەنیشتن. پاشان بەراوردی چاوی هەموو منالەکانی دەکرد و هەمان پرسیاری لە هەمووماندەکردەوە و جوستین هەموو شتەکانی دەنوسی. پاشان دەبوو دەمان زۆر فراوان بکەینەوە ئەویش ئامێرێکی پێ بوو کە قورگ، کونە لوت، لوت، ڕەگی لوت، ماوەی نێوان هەر دوو چاو ڕەنگی چاو، برۆ، گوێچکە لە دەرەوە و لە ناوەوە، مل و دەست(...) هەموو شتێك، هەموو شتێکیان دەپێوایین..

جۆزێف ڕینهاردت، قەرەجێکی ئەلمانی. باس لەو لێکۆڵینەوانە دەکات کە کۆمەڵەی (بایۆلۆژیای ڕەگەز) ئەنجامیان دەدا.




وێنەی ئەم لاپەڕەیەو ئەوەی سەر لاپەڕە ٧٢ لەلایەن (ئیللا لیبەرمان شیبەر)ەوە کێشراون. کە لە بەرلین لەدایك بوەو بۆ ماوەی ١٧ مانگ لە ئاوشوێز بیرکناو بەند بوە، لە حوزەیرانی ١٩٤٥دا و لەتەمەنی ١٧ ساڵیدا ئازاد بوو. بەکێشانی ٩٣ ڕەسم شایەتی خۆیدا.

## لەگەڵ ئەوانەدا کە حوکم درابوون

(کارل پیریچۆدنیك) پۆلیسێکی جولەکە بوو لە گیتۆی (ئۆتووك) لەپۆڵەندا. ناچار کرا تا ژنەکەی خۆی و کیژۆلە بچکۆلەکەی بخاتە ئەو شەمەندەفەرەوە کە بۆ تریبلینکا دەڕۆیشت. پاشان دەنوسێت:

"خۆت لە عەرەبانەی گاگەل گواستنەوەی ژمارە چواردا دەبینیتەوە، ئەو عەرەبانەیە بەتەواوی پڕ کراوە لە ژن و منداڵ، لە هەموو عەرەبانەکەدا تەنها دوو پیاوی تێدایە_ ئایا ئەوانە ئاگاداریتان دەکەن؟ تۆ لەسەر تەختەکە دادەنیشیت و قاچەکانت دەخەیتە بن خۆتەوە و (ئالۆسکا) دەگریتە باوەشت. ئایا منداڵەکە بەم کاتە درەنگە نوستووە؟ بڵێی لەبەر تەنگەبەری عەرەبانەکەو لەو شەوە خنکێنەرەی مانگی ئابدا نەخنکێت؟

تۆ لە نێو ئەو حوکمدراوانەدا بەتەنها دادەنیشیت، ئایا هەستت بەوە نەکردوە کە ئەو نەهامەتیە تەنها تۆی تێ نەکەوتویت و ئەوانەی دەورووبەرت هەموو وەك تۆ وان و بەووەش تۆزێك لە خەمەکانت دەڕەویتەوە؟ نا تۆ بیر لەوە ناکەیتەوە. تۆ دانیشتویت و شتێك هەیە کە تێی ناگەیت. ئەمە چۆن ڕوودەدات؟ (کالینکا)ی هاوسەرت، ئەو کەسەی بۆ ماوەی دە ساڵ تۆی خۆشویست، دڵسۆز بوو بۆت، هەموو ئەوانەی تۆ دەتخواست بۆی بەجێ دەگەیاندی. ئێستا خیانەت لێ دەکات، ڕێدا تۆ بخزێتە عەرەبانەی گاگەلەوەو خۆی مایەوە (...)

ئەزانم ئێستا مشتی خۆت توند دەگوشیت و شەپۆلی قین دژی (ئالۆسکا) هەموو جەستەت دەهەژێنێ. لە مێشکی خۆتدا دەڵێیت ئەمە هەرچۆنێك بێت کچی ئەووەو بۆچی ئێستا بەمن بێت؟ هەڵدەستێتە سەرپێ و دەتەوێت ئەو کۆرپەیە لەپەنجەرەکەوە فڕێ دەیتەدەرێ.

ئانکا.. ئانکا.. ئەو کارە بکە! منداڵەکە فڕێدە دەرێ، با دەستت نەلەرزێ، ڕەنگە ئەو کۆرپەیە بکەوێتە ژێر تایەی شەمەندەفەرە خێرا ڕەوەکەوە و لەت لەتی بکات. ڕەنگیشە ئەگەر بەڕاستی خوا هەبێت، ئەگەر ئەو فریشتانەی کە نابینرێن هەبن، ئەوا فەرشێکی بۆ دادەخەن کە ئازاری نەگات. ڕەنگە ئالۆسکای نازدارت بە ئەسپایی بکەوێتە سەر زەویەکە و بەخەوتویی بکەوێتە خوارێ، دوور لە سکەی شەمەندەفەرەکە. بۆ سبەی چەند دیانێکی (مەسیحی) بەسۆز بەزەییان بەو ڕوخسارە فریشتەیەدا دێتەوەو لەسەر زەویەکە هەڵیدەگرنەوە، دەیگرنە باوەش و دەیبەنەوە بۆماڵەوە و وەك کیژی خۆیان پەروەردەی دەکەن.

ئانکا گیان و ئەوە بکە، بۆ تەنها ساتێکیش دوو دڵ مەبە.

# جیاکردنەوە

لە ١٢ ی تەموزی ١٩٤٢ دا (هێریتا جۆسیاز)لە هامبۆرگی ئەڵمانیاوە و نامەیەك بۆ (هانیلۆرەی) کچی تەمەن ١٧ ساڵان و ئینگلینی خوشکە بچکۆلەکەی نوسی کە وەك پەناهەندە گەیشتبونە (مێللەرود) لە سوید و لە مەترسی ڕزگاریان بووبوو. هێریتا دەیزانی کە ڕادەگوێزرێت بەڵام نەیدەزانی بەرەو کوێی دەبەن. دەنوسێت: هانیللە گیان تکات لێ دەکەم کە زۆر ئاگات لە ئینگلین بێت. دەبێت ببیت بە دایك و باوکیشی. دڵنەرم بە لەگەڵیدا و بەڵێنم بدەرێ هەمیشە چاودێری بیت. پێکەوەبن و چاوت لێیەوە بێت. من متمانەی تەواوم پێتە ئەی کیژۆڵە گەورەکەم. بۆ ماوەیەك لێك دادەبڕێین و ئاگامان لێك نامێنێ بەڵام هەر بۆم کرا نامەتان بۆ دەنوسم. "هێریتا جۆسیاز نامەکەی بە دوعا خواستن و پاڕانەوە لە یەزدان کۆتایی دێنێت کە خودا ئاگاداری کچەکانی بێت و ئەویان بیرنەچێتەوە. ئەم جۆرە نامانە لە لایەن ئەو کەسانەوە دەنوسران کە چاوەڕێی مەرگیان دەکرد. [٢٨]

چەندین لەو نامانە ئێستا پارێزراون. ئەو نامانە بەڕاستی ڕەنگدانەوەی ئێش و ئازاری ئەو خێزانە جولەکەو قەرەجانەن کە بەدەست نازیەکانەوە تالاویان دەچێشت. دایك و باوك لە ڕۆڵەکانیان و ڕۆڵە لە دایك و باوك جوێ دەکرانەوە. ئەوانەش کە ئەو دایك و باوك و منداڵانەیان لێك جیا دەکردەوە خۆیان دایك و باوك بوون و منداڵیان هەبوو. بەڵام ئەوە بەهیچ جۆرێك کاری تێ نەدەکردن.

دوای ڕۆژێك کارکردن لە ئاوشوێز ئەو دکتۆرانەی لەوێ کاریان دەکرد دەگەڕانەوە نێو ماڵ و منداڵی خۆیان کە لە نزیك ئۆردوگاکەوە دەژیان. ڕەنگە تا ئێستا هەزاران دایك و باوکیان ڕەوانەی ژوورەکانی گاز کردبێت بۆ کوشتنیان. چۆن دەیانتوانی ئەوکارانە مانگ دوای مانگ ئەنجام بدەن و لە هەمان کاتدا مێرد و باوکێکی بەسۆز بن بۆ ژن و منداڵەکانی خۆیان؟ پرسیاریان لە هێرمان فرێدریك گرێبە کرد کە ئەندازیارێکی ئەڵمانی بوو: بۆچی لەکاتی جەنگدا ئەو منداڵانەت ڕزگار کرد؟ ئەو نەیتوانی دەریببڕێت چۆن و بۆچی. هەر ئەوەندەی وت کە دایکی لە خێزانێکی هەژارە و زۆریش دایکی لا مەبەستە. لەکاتی منداڵیدا ئەو و چەند هاوڕێیەکی گاڵتەیان بە پیرێژنێکی جولەکە کرد.. گرێبە دەڵێت "دایکم پێی وتم نابێت هەرگیز ئەو کارە بکەیت. بۆچی ئەوەت

کرد؟ دیارە منیش وەڵامم دایەوەو وتم" چونکە هەموو ئەوانەی تر کردیان. بەتوندی وتی: تۆ وەك ئەوانەی تر نیت تۆ کوڕی منیت. جارێکی تر شتی وانەکەیت. ئەگەر جارێکی تر شتی وابکەیت، ئەیبینیتەوە چی ئەکەم. ئەتەوێت وەك ئەوت لێ بێت؟ وەڵامم دایەوە، نەخێر. "کەواتە پێم بڵێ بۆچی وات کرد؟" جارێکی تـر دوبارەی نەکەیتـەوە. ئـەو ژنـە هەسـتی هەیـە، ئـەو ژنـە دڵـی هەیە. وەك من و تۆ وایە. جارێکی تر شـتی وا مەکە. (..)بەم شـێوەیە دایکم هـانیدام "خـەڵك وەك خۆیان سـەیرکە. نە بە ئیش نە بە ڕوکەش یان دین و باوەڕیان سـەیریان مەکە، بەڵکو وەك مرۆڤێك"

ئەگەر هـەموو هۆیەکان بۆ پەروەردەکردنی دایك و باوك بۆ منالانیـان بگێڕینـەوە ڕەنگـە زیـاد ڕۆشتبین بەڵام ناشکرێت ئەو لایەنە گرنگی خۆی نەدرێتێ.



خواحافیزی

شەمەندەفەرەکانی ڕاگواستن لە جولە ناکەون. تێریز میولەر کە ژنێکی هەنگاری بوو کە لە ئاوشویز ڕزگاری بوو بوو دەگێڕێتەوە: "تیشکی ڕۆژ لە پەنجەرەیەکی بچوکەوە دەهاتە ژورێ. چاومان لە شاخ و داخ و دارستانەکان بوو کاتێك بەلایاندا تێپەڕ دەبوین. ئەو درەختانەی دەرەوە دەیانەوێت چیمان پێ بلێن؟ دەنگی شەمەندەفەرەکان لەکاتی هێل گۆڕینیاندا و هاشەیان و چیمان پێ دەلێن؟ من ئێستا چاوم لە کەس نیە و هەمویان وەك تارماییەك دەبینم. هەموویان چاوەڕێن یان خەوتوون. هەموو خامۆشن. ئەم خەلکە کەسوکاری منن و ئێمە هاوکاری یەکتر دەکەین. بەلام دلنیاشم کە ئەمە لێك جیابونەوەیە. دلنیام کە زۆربەمان کۆتاییمان دێت. هەول ئەدەین هەموو شتەکان وەك خۆیان وەرگرین. ئێستا بەرەبەیانەو دایکم دەستی گرتووم، ئەمەیە لێك دابڕان."

ئەوە نوسینی سەر یەکێك لە عەرەبانەکانی گواستنەوە بوو کە بە قەلەمی ڕەساس نوسرابوو. . [٢٩]

لێرە لەم عەرەبانەیەدا
من، ئیڤام لەگەل ئەبێلی کوڕمدا
ئەگەر کاینی کوڕی ئادەم کوڕە گەورەمت بینی
پێی بلێ کە من

دان پاگیز

ئەوان چاوەڕێی
خراپتر بوون _ چاوەڕێ نەبوون
ئەوەی بەبیردا نەدەهات بقەومێ

چارلۆت دیلبۆ



ئەیلولی ١٩٤٢ . گیتۆی لۆدز. کوڕێکی لاو خواحافیزی لە خێزانەکەی دەکات. ئەلمانیەکان بڵاویان کردەوە کە دەبێت دانیشتوانی گیتۆکە کەم بکرێتەوەو تەنها ئەو کەسانەی توانای کاریان هەیە ئەتوانن بمێننەوە. بەم پێیەش پتر لە ١٥٠٠٠ خەلکی نەخۆش و پیر و منداڵی خوار تەمەن ١٠ ساڵان لە نێوان ڕۆژانی ٥ تا ١٢ی ئەیلول دورخرانەوە. لە گیتۆوە گواستیاننەوە بۆ ئۆردوگای مەرگی (چێلمنۆ) کە ٧٠ کیلۆمەتر لە باکوری ڕۆژئاوای لۆدزدا بوو.

لەوێ هەموو بە گاز لە نێو ئەو واگۆنانەی تایبەت بۆ ئەو مەبەستە دروست کرابوون کوژران. پاش ئەوەی کارەکە کۆتایی هات، واگۆنەکان گواسترانەوە بۆ دارستانێك چەند کیلۆمەترێك لەوێوە دور بوو لەوێش هەموو لاشەکان سوتێنران.

## گواستنەوە بە پاپۆڕی ئیس. ئیس دۆناو

لە بەرەبەیانی ٢٦ی تشرینی دوهەمی ١٩٤٢دا ٥٣٢ جولەکەی نەرویجی بەزۆر سواری پاپۆڕی ئیس. ئیس دۆناوی ئەلمانی کران. هەر ئەو ڕۆژەی ئۆسلۆی بەجێ هێشت و ئەو گروپە ڕۆژی ١ی کانونی یەکەم گەیشتنە ئاوشویز بیرکناو. پیرێژن و منداڵەکان یەکسەر لەو ژورانەدا کە پێیان دەوترا (بونکەر٢ ) بەگاز کوژران. پیاوەکان بەرەو کاری سوغرە بران. ئەلمانیەکان و نەرویجیەکانی هاوکاریان هەرگیز وازیان لە گەڕان و پشکنین بەشوێن جولەکەدا نەهێنا و تا ساڵی ١٩٤٤ نزیکەی ٧٧٠ جولەکەی بەرەو ئاوشویز بیرکناو ڕاگوێزران. تەنها ٢٤ کەس پاش جەنگ ڕزگاریان بوو. جولەکە نەرویجیەکان خۆیان ملی ڕێیان گرت و بەبێ هیچ هاوکاری و یارمەتیەك گەڕانەوە شوێنی خۆیان.

## کە هەموو شتەکان زەوت دەکرێن

هێرمان شوارتز جولەکەیەکی نەرویجی بوو کە لە قەتل و عام ڕزگاری بووبوو بەم شێوەیە وەسفی ڕاگواستن دەکات:

نیوەڕۆ گەیشتینە ئۆسلۆ. ئاسمان خۆڵەمێشی و هەوا ناخۆش بوو. دەنگی لورەی ئینزار کە بۆ ئاگادارکردنەوە لە هێرشی ئاسمانی لێ دەدرا بەردەوام بوو. هیچ مەدەنیەکی نەرویجی چاوی لەوە نەبوو چی ڕوودەدات. لەگەڵ ئەوەشدا خەڵك لەبەردەم خاڵی کۆنترۆلی ڕەسیفی دەریا بەرەو ئەمەریکا وەستابوون. چەند هاوڕێیەکی نەرویجی لەدەرەوەن، لە پەنجەرەی ئیسعافەکەوە چاوم لێیانە.

هەروەها چەند شتێکی ترم بینی. ئاسنی پاپۆڕێکم بینی ڕەنگ خوڵەمێشی تەنها ٧ تا ٨ مەتر لێمانەوە دوور بوو ئەوە پاپۆڕی ئیس. ئیس دۆناو بوو. کە لە (برێمن)ەوە هاتبوو. پاپۆڕی کۆیلەکان بوو. لە دەرەوەی واگۆنەکە هاواری کابرایەکمان هاتە گوێ و کە باسی گرتنی ژن و منداڵیشی دەکرد. زانیمان کە ژن و منداڵانیش گیراون. پرۆفیسۆر (ئەپستێن) بەتەواوی ڕوخاو دایە پرمەی گریان. هەموو ورەمان بەردا منیش هەروەها. چی تر ئەو سەربازە نەرویجیانە نابینینەوە کە چاودێریان دەکردین، هەموویان گۆڕابوون بە سەربازی ئیس. ئیس و بەرگی

سەوزیان لەبەردا بوو، ئەو ناوە پڕ بوو لەوان بە دەم شیرەی ئەفسەرەکانیانەوە ئێمەیان لە واگۆنەکان دەبەزاندو بە ڕێڕەوەکەدا بردیانین بۆ ناو پاپۆڕەکە. ئێمە کە نەخۆش بووین لە ریزی پشتەوە بوین و بەچاوی خۆمان هەموو شتێکمان بینی. ژن و پیاو و منال لە هەولێکی بێ ئاکامدا بوون دژی دەسەلاتێکی درندەی بەهێزی دلرەق. دیوارێکی پۆلاینی زیندو دەوری ئەو خەلکە بێ چارەیەی داوە. بۆ ئێمە کە لە ولاتێکدا گەورە بووبوین پڕ خۆشەویستی و برایەتی بوو، بینینی ئەو دیمەنە تۆقێنەرانە گەلێك ستەم بوو، ئەو دیمەنانە زۆر لەخەوی ناخۆش خراپتر بوون.ئەمە یەکەم سەدمە بوو و نەماندەزانی کە لەوەش خراپتر ڕوو دەدات.



پتر لە ٦٠٠ کەس کە لەوانەی هیوای زۆریان بە دادپەروەری و ژینی ئارام هەبوو، لەپڕدا هەموو شتێکیان لەدەست چوو، ئازادی، ولاتەکەیان، لە هەمووی خراپتر مرۆڤایەتیەکەیان. پالیان پێوە دەنرێت و تێیان هەلدەدرێت و لێیان دەدرێت، دەپارانەوە تا سواری پاپۆڕەکە نەکرێن. ، چونکە دەیانزانی چی چاوەڕێیانەو ڕاگواستن مانای چییە. خۆیان لەسەر ڕەسیفەکە دەدا بەزەویدا و قژی خۆیان دەرنیەوەو داوای بەزەییان بۆ خۆیان و ئازیزانیان دەکرد. بەلام کەس لێیان خۆش نەدەبوون. بە لەقەو پیلاوی پڕ بزمارەوە دەچونە سەر ورگ و سەریان. دایکان و ساوا بە باوەشەوە وەك یەك تێ هەلدەدران. ژنی دووگیان (حاملە) پال دەنراو تێی هەلدەدرا. جلەکانیان شڕوپڕ کراو پێستی ڕوتیان وەدەرکەوت. مندالی بچکۆلە لەو ناوە فڕێ درابوون. لەناو ئەوانەشدا. بە چاوی خۆم. ریزی ئەو پیرێژنە بێ هێزانەم بینی کە بەئەسپایی ڕێیان دەکرد. ئەو پیرەمێرد و پیرێژنە لاوازانەم بینی کە زۆر بە هیواشی بەسەر ئەو پردەی بۆ ناو پاپۆڕەکە دەچوو، ئەملاولای بە حەبل گیرابوو، هەموو سەریان بۆ خوارەوە نەوی کردبوو و دەڕۆیشتن و چارەنوسی خۆیان لەبەرچاو بوو. ئەوان لە ئێمەی لاو تێگەیشتووتر بوون، ئەوان پێش وەخت گیانیان سپاردبوو"

## رێی شەمەندەفەرە تایبەتەكان

تۆڕی هێڵی شەمەندەفەری پێشكەوتوی ئەوروپا ڕۆڵێكی گەورەی بینی لە سازدانی قەتڵ و عامدا. چەند ملیۆن كەسێك بەهۆی شەمەندەفەری تایبەتەوە ڕاگوێزران. شەمەندەفەری مسافر یان شت گواستنەوە لە سەرانسەری ئەوروپاوە خەلكیان دەگەیاندە ئۆردوگاكان، گیتۆكان و ترانزێتەكان و ئۆردوگاكانی مەرگ. بەهۆی سەرقالی ئەلمانیەكان بەم گواستنانەوە، سوپای ئەلمان زۆری چێشت (چونكە زۆربەی شەمەندەفەرەكان بەگواستنەوەی ئەو خەلكانەوە گیرابوون). هێزەكانی ئێس. ئێس. شەمەندەفەریان بەكرێ دەگرت و جولەكەكانیان ناچار دەكرد پارەی سەرێك بدەن. هێزەكانی ئێس. ئێس. داوایان لەو خەلكە دەكرد كە خۆیان پارەی كوژرانی خۆیان بدەن.[٣٠]




ئەم نەخشەیە ڕاگواستنی جولەکەکان لە گێتۆکاندا لە نێوان پۆلەنداوە بە ترێبلنکادا.
لە ژێرەوە خشتەیەکی کاتی ڕۆیشتن و هاتنی شەمەندەفەرێکی تایبەت دیاری دەکات لە ڕۆژی ٢٥ ئەیلولی ١٩٤٢دا. لە (سزیدلۆێك)ەوە بەتەواوی باردەکرێت و بارەکەی ٨٠٠ تەن و ڕۆژی دوابی سەعات ١١:٢٤ یانزە و بیست و چوار دەقیقە دەگاتە تریبلنکا" شەمەندەفەرە خالیەکە ٦٠٠ تەن دەگەڕێتەوە بۆ (کۆزلینتشە) پاش نیوە شەو دەگاتە ئەوێ. بەباری تەواوەوە دەچێتە ترێبلنکا و بە بەتالی دەگەڕێتەوە. ڕۆژ دوای ڕۆژ و مانگ دوای مانگ لە تەموزی ١٩٤٢ەوە تا ئابی ١٩٤٣.

١٩٤٣

١٨کانون٢. . یەکەم ڕاپەڕین لە گیتۆی وارشۆ بەرپا بوو.

٢شوبات. . هێزەکانی سۆڤیەت سوپای ئەڵمانیایان لە (لینینگراد) تێکشکاند.

٢٢شوبات. . لە سێدارەدانی (سۆفیا سکول) ی ئەندامی ڕێکخراوی (گوڵی سپی) کە ڕێکخراوێکی خوێندکاران بوو لە زانکۆی میونخدا. پاش ئەوەی لەلایەن دادگایەکی تایبەتی نازیەکانەوە حوکم درا.

٢٦ شوبات. . یەکەم شەمەندەفەری پڕ لە قەرەجی ئەڵمانی گەیشتە ئۆردوگای (ئاوشوێز).

٢٢مارس-٢٦حوزەیران چوار فڕن کە ژووری گازیان تێدابوو، لە ئاوشوێز دروست کران و ئامادەبوون بۆ کارکردن.

١٩-٣٠ نیسان. . نوێنەرانی ئەمەریکاو بەریتانیا لە دورگەی بەرمۆدا کۆبونەوە بۆ لێکۆڵینەوە لە چۆنیەتی ڕزگارکردنی جولەکەکانی ئەوروپا. بەڵام نەگەیشتنە ئەوەی هیچ پلانێکی تۆکمە داڕێژن.

١٩ نیسان. . ڕاپەڕین لە گیتۆی وارشۆ بەرپا بوو.

١٦مایس. . ڕاپەڕینەکەی گیتۆی وارشۆ تێکشکێنراو گیتۆکەش کاول کرا.

٨حوزەیران. . شەمەندەفەرێکی پڕ لەدایك لەگەڵ ٣٠٠٠ منداڵدا. لە هۆڵەنداوە بەرەو ئۆردوگای (سۆربیبۆر) ڕاگوێزران و هەر بەگەیشتنیان خرانە فڕنی گازەوە و کوژران.

١١ تەموز. . هیتلەر و بەکارهێنانی ڕستەی "چارەسەری بنەڕەتی بۆ کێشەی جولەکە" بەشێوەیەکی ئاشکرا قەدەغە دەکات.

١-٢ تشرینی ١. . دانیمارکیەکان هەوڵ بۆ ڕزگاردنی جولەکەکانی دانیمارك دەدەن.

١٩٤٤

١٩مارس. . ئەڵمانیا هەنگاریای داگیر کردو، کەوتە ڕاگواستنی جولەکە هەنگاریەکان.

٦حوزەیران. . ڕۆژی D هاوپەیمانەکانی ڕۆژئاوا هێزیان لە نۆرماندی دابەزاند.

٢٠ تموز. .  چەند ئەفسەرێكی ئەڵمانی ویستیان هیتلەر بكوژن.

تەموز. .  ئۆردوگای (ماجیدانكێ) لەلایەن سوپای سورەوە ئازاد كرا.

٢ ئاب. .  خێزانە قەرەجەكانی ئۆردوگای ئاوشویز بەكۆمەڵ لێیان دەكوژرێت، تەنها لەیەك شەودا ٢٨٩٧ قەرەج لەو ئۆردوگایەدا بەگاز كوژران.

تشرینی٢. .  بەكارهێنانی گازی (زایكلۆن.بی) بۆ ئیعدام كردن لە ژوورەكانی ئۆردوگای ئاوشویز، ڕادەگیرێت.

١٩٤٥

١٧-١٨ی كانونی ٢. .  هێزەكانی ئێس. ئێس. بەزۆر دەستیان كرد بە چۆڵكردنی ئۆردوگای ئاوشویز. خەڵكەكە ناچار كران بە پێ بەرەو ئەڵمانیا بكەونە ڕێ بەو ڕۆیشتنە وترا (ڕەوی مەرگ).

٢٧ كانون٢. .  ئازادكردنی ئۆردوگای ئاوشویتز لەلایەن سوپای سورەوە.

١١ نیسان. .  ئۆردوگای (بوخین والد) لەلایەن ئەمەریكیەكانەوە ئازادكرا.

١٥نیسان. .  ئۆردوگای (بێرین بێلسن) لەلایەن سوپای بەریتانیاوە ئازاد كرا. .

٢٩-٣٠نیسان. .  ئازادكردنی ئۆردوگای (ڕیڤینس بروك) لەلایەن هێزەكانی سۆڤیەتەوە زیاتر لە ٣٥٠٠ ژنی بەندكراو ڕزگاركران.

٣٠ نیسان. .  هیتلەر خۆی كوشت.

٧-٨مایس. .  خۆبەدەستەوەدانی ئەڵمانیا. . ڕۆژی سەركەوتن. . جەنگ لە ئەوروپا كۆتایی هات.

"بەم شێوەیە هەرچی بەندی جولەکە هەبوون پیاوو ژن، منداڵ و پیر بەزۆر خزێنرانە واگۆنی گاگەل گواستنەوەوە. بەرەوە ئەڵمانیا یان پۆڵەندا ڕاگوێزران (..)

لە بودانبیستدا، جولەکەکان لە هەموو موڵك و ماڵ و کەلوپەلیان داماڵران. ئێستا هەر ٨-١٠ کەسیان لە تاکە ژوورێکدا دەژین.

ئەوانەش کە بەختیان هەبوو و دەیانتوانی کارێك بکەن و بۆ کارکردن بەکەڵك دەهاتن گواسترانەوە بۆ ئەڵمانیا تا لە کارگەکاندا کار بکەن و تۆزێك ژینیان بەرەو باشتر بگۆڕێت. ئەوەی کە دەمێنێتەوە لەولا، منداڵ و ژنی لاواز و نەخۆش و پیر و پەککەوتە، بەرەو ئۆردوگای مەرگی (ئاوشویز بیرکناو)ی نزیك (کاتاویز) لە پۆڵەندا ڕاگوێز دەکرێن.

لە ڕاپۆرتێکی (ئیڤان دانیلسۆن)ی نوێنەری سوید لە بودابیست، کە بۆ وەزارەتی دەرەوەی وڵاتی خۆی ناردوە لە ستۆکهۆلم.

٢٤ی حوزەیرانی ١٩٤٤

ویدمان، ئایا پەیمانگاکانی زانستی تاوان و
کارگەکان
دەتوانن بڕێکی زۆر ژەهری کوشندە دروست
بکەن.
بۆچی ؟ بۆ خەڵك کوشتن ؟
نا
بۆ ئاژەڵ کوشتن؟
نا
ئەی گوایە بۆچی؟
بۆ کوشتنی ئەو دڕندانەی لە شێوەی مرۆڤدان،
واتە
ئەوانەی نەخۆشی دەرونی و عەقڵییان هەیە،
ئەوانەی
کە چیتر ناکرێت وەك مرۆڤ سەیریان بکرێت،
ئەوانەی کە ئومێد لە چاك بونیان ناکرێت.

ئەوە گفتوگۆیەکی نێوان دکتۆر ئەلبێرت ویدمان و سەرۆکی بەشی کیمیا لە پەیمانگای تەکنۆلۆژیای تاوان، لەگەڵ بەرپرسێك لە بارەگای ئەدلۆف هیتلەر.
تەموزی ١٩٣٨

## جینۆساید دەستی پێكرد

پێش كوشتنی بەكۆمەڵ و بەردەوامی جولەكەكانی ئەوروپا، بەرەزامەندی دەوڵەت چەندین نەخۆش و پەككەوتە و هاندیكاپی ئەڵمانی و شێت و ئەوانەی پێیان دەوترا (ناكۆمەڵایەتی)یەكان، هەموو لەناوبران و ئەو كارە پێی وترا، (پرۆسەی T4) كە لە تشرینی دوهەمی ١٩٣٩ەوە لەلایەن بارەگای هیتلەر خۆیەوە سەرپەرشتی دەكرا. لە سەرانسەری ئەڵمانیادا ئەو نەگبەتانە لە خەستەخانە و خانەی پەككەوتەوە وە بەهۆی پاسی ڕەنگ خۆڵەمێشی كە شوشەكانی ڕەنگی تاریك كرابوون یان پەردەیان پێوە بوو، كۆدەكرانەوەو بەرەو بنكەكانی (مەرگی پڕ بەزەیی) ڕەوانە دەكران، ئەو بنكانە ژووری گازیان تێدابوو. پزیشكەكان بڕیاریان دەدا كێ پاكژ بكرێت، واتە بنێرێت بۆ مەرگ. پاشان نامەیەكیان بۆ كەس وكارەكەی دەنارد كەتیایدا نوسرابوو "بەڕێز... وەك خۆتان دڵنیان كە (فرویلین)ی كچتان.. گواسترابۆوە بۆ پەیمانگاكەمان بە فەرمانێكی وەزاری ... دڵتەنگین كە پێتان ڕابگەیێنین كە بەداخەوە بەهۆی هەڵامەتەوە گیانی سپارد.. بەداخەوە پزیشكەكان زۆریان هەوڵدا تا گیانی ڕزگار بكەن بەڵام نەیانتوانی." زۆرجار چەند پارچەیەك لە لاشەی كوژراوەكەی (مەرگی پڕ بەزەیی) لێ دەكرایەوە دەنێردرا بۆ یەكێك لە كۆلیژە پزیشكیەكان تا دەرسی لەسەر بخوێنن.. بەلایەنی كەمەوە ١٢٠,٠٠٠ خەڵكی بێ تاوان لە نێوان ساڵانی ١٩٤٠–١٩٤٥دا بونە قوربانی پرۆسەی (مەرگی پڕ بەزەیی)

ڕای گشتی و دەنگی خەڵكەكە مەكتەبی (فۆهەر)یان بێزاركرد و بەناچاری لە ئابی ١٩٤١ دا ئەو كارە ڕاگیرا و بەڵام بەشێوەیەكی نارەسمی و بەدزیەوە چەند ساڵێكی تریش بەردەوام بو.

لەلایەكی ترەوە كوشتن و ڕەمی كردنی جولەكەكان لە وڵاتانی بەڵتیق و ناوچە داگیركراوەكانی سۆڤیەتدا گەیشتبونە لوتكە و پاش یەك هەفتە لە كۆمەڵكوژی یەكێك لە گەورەترین كوشتار لە ٢٩–٣٠ ئەیلولدا لە كەندەڵانی (بابی یار)ی نزیك (كیێڤ) ئەنجام درا، كاتێك هێزەكانی ئێس.ئێس (ئینستاغ) بەهاوكاری پۆلیس ٣٣,٣٧١ ژن و پیاو و منداڵی جولەكەیان كوشت.

بەسەرۆكایەتی (هەنریك هیملەر)ی ئەندازیاری كۆمەڵكوژی، هێزەكانی ئێس.ئێس. بەرپرسێكی ڕاستەوخۆی جینۆساید بوون. لە تشرینی یەكەمی ١٩٤٣دا هیملەر باسی "لەناوبردنی خەڵكی جولەكە" و دڵسۆزی هێزەكانی لەو كۆمەڵكوژیەدا بەم شێوەیە دەكات و دەڵێت" ئێمە وەك مافێكی ئەخلاقی، ئەركێكی سەرشانمانە بەرامبەر بەگەلەكەمان، تا ئەوانە بكوژین كە دەیانەوێت

بمانکوژن ( . . ) ئێمە ئەم ئەرکە گرانەمان خستۆتە سەرشانی خۆمان لەپێناوی خۆشەویستی گەلەکەی خۆماندا. ئەوەش هیچ ئازارێکی ناوخۆیی بەخۆمان ناگەیێنێت"[٣١] ئەو تاوانە گەورانە لەبەرچاوی ئەوان کارێکی زۆر ڕەوا بوو.

یەکێك لەو چیرۆکانەی پاش جەنگ دەیانگێڕایەوە گوایە هەرکەس ڕازی نەبێت ئەو کارە ئەنجام بدات یان بەشداری لەو کۆمەلکوژیە نەکات، خۆی ئیعدام دەکەن. بەلاٌم هیچ حالەتێك لەو چەشنە نەبیستراوە[٣٢].

لەڕاستیدا ئەو خەلکە کەمەی کە نەیاندەویست بەشداری ئەو تاوانانە بکەن، دەیانگوڕین هەرگیز سزا نەدەدران. زۆربەی ئەوانەی تر کەبەشداربوون، جولەکەیان وەك مێرویەکی زیانبەخش سەیر دەکرد کە پێویستە لەناوببرێت. هێندێکیان پێیان وابوو کارێکی پیرۆز دەکەن لە پێناوی (فۆهەر) باوکی ولاٌتدا. ئەگەر ئەو کارانە بەنهێنی ئەنجام بدرانایە ئەوا زۆر لە ئەنجامدەرانی بەهۆی مولك ومالی قوربانیەکانەوە دەولەمەند دەبوون.



چەند پاسێك لە بەردەم خەستەخانەی (ئایخبێر)دا ڕاوەستاون بۆ گواستنەوەی نەخۆشەكان بۆ بنكەی هادمار (ئیوتانسیا - كوشتنی پڕ بەزەیی) لە وێنەی لاپەڕە (١٢٠)دا دوكەڵ لە لاشە سوتاوەكانی هادمار بەرز دەبێتەوە.



"هەموو هەفتەیەك چەند پاسێك دەگەیشتنە (هادمار) و لەگەڵ خۆیاندا ژمارەیەکی زۆر لەو کڵۆڵانەیان دەهێنا. منالآنی دراوسێ هەموو پاسەکانیان دەناسیەوە و دەیانوت: ئەوا سەیارە تاوانبارەکان هاتنەوە، پاش گەیشتنی ئەو جۆرە سەیارانە، خەلکی هادمار ئەو دوکەلەیان دەبینی کە لە سوتاندنی لاشەی قوربانیەکان لە دوکەڵکێشەکەوە دەهاتەدەرێ و هەمیشە دڵ تەنگ و بیریان لەو قوربانیە داماوانە دەکردەوە. بەتایبەت کاتێك بەهۆی کزیە بایەکەوە ئەو بۆنە ناخۆشە بڵاودەبۆوە. یەکێك لەدەرئەنجامی ئەو کارەی لێرە ئەنجام دەدرا لە هەڵسوکەوتی منالآندا ڕەنگی دابۆوە، کاتێك دوو منال شەڕیان دەبوو یەکێکیان بەوەی تری دەوت" هەی نەخۆش، تۆ بۆ ئەوە باشیت بتخەنە فڕنەکەوە لە هادمار"[٢٢]

نامەیەك لە قەشەیەکی کاتۆلیکەوە لە لیمبۆرگ.. کە لە ١٣ی ئابی ١٩٤١دا بۆ وەزیری دادی ڕەوانە کردبوو.


VON DER EINSATZGRUPPE A DURCHGEFÜHRTE
JUDENEXEKUTIONEN
PETERSBURG
KRASNOGWARDEISK
REVAL
963
JUDENFREI
3600
RIGA
35,238
SCHAULEN
136,421
KAUEN
GHETTO 450
41,828
MINSK
GESCHÄTZTE ZAHL DER NOCH VORHANDENEN JUDEN 128,000

## له بەڵتیقدا

ئەو نەخشەیەی (لاپەڕە ١٢١) بە ڕاپۆرتێکی یەکەی (ئینساتز ١.)وە لێکنرابوو کە بە شێوەیەکی سەرەکی لە وڵاتانی بەڵتیق کاریان دەکرد. تیایدا ژمارەی ئەو جولەکانە دیاریکراوە کە ئیعدام کراون و بەوێنەی تابوتێك و ژمارەیەك لە تەنیشتیەوە دیاریکراوە کە ژمارەی لاشەی کوژراوەکانە. لەسەر ئیستۆنیا نوسراوە کە جولەکەی تێدا نەماوە. ڕستەکەی ژێرەوە دەڵێت: ژمارەی ئەو جولەکانەی کە ڕەنگە تا ئێستا مابن نزیکەی ١٢٨,٠٠٠ کەس بن. لە وڵاتانی بەڵتیق، وەك بیلۆروسیا، ئۆکرانیا، ئەڵمانیاکان هاوکاری چاك دەکران چ لەلایەن میلیشا ناوچەیەکانەوە و چ لەلایەن سوپای ئەڵمانیا خۆیەوە.

ئەڤراهام تۆری پارێزەرێك بوو کە لە گیتۆی (کاوناس) لە لیتوانیا ڕزگاری بوو بوو لە بیرەوەریەکانیدا باسی ڕۆژێکی ساڵی ١٩٤١ دەکات کاتێك خەڵکەکەیان کۆکردەوە تا بزانن کێ دەمێنێتەوە و کێ دەبێت بکوژرێت؟

"بەرەبەیانی ڕۆژی سێ شەممە ٢٨ی ئۆکتۆبەر ڕۆژێکی باران بوو، زۆر بەزەحمەت ئاسمانت دەبینی چونکە هەور و تەم بەری گرتبوو. هەموو گیتۆکە تاریك داهاتبوو. بەفرێکی کەم باری و بەتەنکی زەویەکەی داپۆشی. لە هەموو لایەکەوە خەڵك سەرەیان گرتبوو و بە ئەسپایی و خاوی بەرێدا دەڕۆیشتن و پیرێژن و پیرەمێرد و نەخۆشەکان دەستیان گرتبوو بە کەسوکار و دۆست و دراوسێکانیانەوە. منداڵە ساواکان بە باوەشی دایکیانەوە بوون، سەرەیەکی درێژیان دروست کردبوو.

هەموویان پاڵتۆی زستانەیان لەبەردابوو، شاڵ و بەتانیان لە خۆیان ئاڵاندبوو تا خۆیان لەو سەرما و سوڵەیە بپارێزن. هێندێکیان مۆم یان چرایان بەدەستەوە بو تا بەرپێی خۆیان ڕوناك بکەنەوە. زۆربەی خێزانەکان دەستی یەکتریان گرتبوو زۆر خاو ڕیزەکە دەچوە پێشێ. هەموویان بەرەو هەمان شوێن ملیان دەنا بەرەو فولکەی دیموکراتی.. وەك ڕۆیشتن لەپشت جەنازەوە وابوو، خۆیان مردوەکان بوون. نزیکەی ٣٠ هەزار کەسی کلۆڵ ئەو بەیانیە بەرەو چارەنوسێکی نادیار دەبران. بەرەو ئاکامێك کە پێشتر حاکمێکی دڵڕەق و خوێنمژ بڕیاری لەسەردابوو. بێ دەنگیەکی خامۆش وەك هی مردوو بەسەر ئەو خەڵکەدا کشابوو، هەموو یەك لەوانەی خۆی کێش دەکرد و

بیریان دەکردەوە، هەریەکەو بیری لە چارەنوسی خۆی و خێزانەکەی دەکردەوە کە ژیانی هەر یەکێکیان بە پەتێکی باریك پێکەوە بەسترابوو.

سی هەزار خەلکی تەنیا و بێ کەس. خواو دنیاش لەبیری کردوون. بۆ حوکمی ستەمکارێك بەجێ ماون کە دەستی بە خوێنی چەندەها جولەکە سور بووە.

## هێزە تایبەتەکان

"پرۆسەی بارباڕۆسا" یان چونە ناوەوەی سوپای ئەلمانیا بۆ ناو یەکێتی سۆڤیەت لە ٢٢ی حوزەیران ١٩٤١دا سەرەتایەك بوو بۆ ئەوەی پێی دەوترا "چارەسەری بنەڕەتی" واتە کوشتاری بەکۆمەل و نەخشە بۆ دارێژراوی جولەکەکانی ئەوروپا. هەر یەکسەر بەدوای سوپای ئەلمانیادا چوار کۆمەل لە گروپی بچکۆلەی گواستراوە کە پێیان دەوترا "گروپی ئینستاز" یان هێزە تایبەتەکان بەدوای سوپادا دەچونە پێش. لە حوزەیراندا ژمارەی ئەو هێزە تایبەتە بریتی بوو لە ٣٠٠٠ پیاوی بەهێز و هەلبژاردە لە هێزەکانی پۆلیس و ئیس.ئیس. و ئاسایش. ئەرکی سەرەکیان کوشتنی گەورە سیاسەتمەداران و ئەفسەرانی سۆڤیەت و جولەکەو ئەندامانی حیزب بوو. سوپا پاریزگاری گواستنەوە و هاتوچۆیان و کارکردنیانی دەکرد. پاشان ئەو ئەرکەیان گۆڕا بەشێوەیەکی سەرەکی بوو بە کوشتن و لەناوبردنی جولەکە. چەندین قەرەجیش بەر شالاوی ئەمانە کەوتن و کوژران. ئەم گروپانە هەموو ئەو کارانەی ئەنجامیان دەدا بەنوسین بەرلینیان لێ ئاگادار دەکرد. بەهۆی راپۆرتەکانی ئەوانەوە ئێستاش دەتوانرێت لێکۆلینەوە لەسەر ئەو تاوانانەیان بکرێت و رۆژبەرۆژ بزانرێت چیان ئەنجام داوە.

یەکێك لەو دۆکیومێنتانە لیستێکی حەوت لاپەڕەیی تێدایە کە هەموو ئەوانەی تێدا تۆمارکراوە کە بە فەرمانی هێزەکانی ئینساتزا لە لیتوانیا لە نێوان ٤ی تەموز تا ١ی کانونی یەکەمی ١٩٤١ ئیعدام کراون. ژمارەی ئەو کەسانە ١٣٧,٣٤٦ قوربانیە. لەوانە.. کۆمۆنیستی ڕوسی و لیتوانی و دیلە ڕوسیەکانی جەنگ، دەرون نەخۆش و شێتەکان، لیتوانی و پۆلەندی و قەرەج، بەلام زۆربەی هەرە زۆری قوربانیەکان پیاو و ژن و مندالی جولەکە بوون. لەو بەشەی لە بیرەوەریەکانی ا. تۆری هەلبژێردراوە، باس لەوە دەکات چۆن بەرەبەیانی رۆژی ٢٨ی ئۆکتۆبەر جولەکەکان لەگێتۆی

کاوناس ملی ڕێیان گرتبوو بەرەو هەڵبژاردنەکەی گۆڕەپانی دیموکراتی. ڕاپۆرتێکی ٢٩ی تشرینی یەکەم دەڵێت کە :

"٢٩-١٠-١٩٤١ کاوناس... ٢٠٠٧ پیاوی جولەکە، ٢٩٢٠ ژنە جولەکە ٤٢٧٣ منالی جولەکە (پاککردنەوەی گیتۆکە لە جولەکەی زیادە) ٩٢٠٠ جولەکە". وادەردەکەوێت لە ئەوروپای ڕۆژهەڵات و یەکێتی سۆڤیتی پێشو ژمارەی ئەو کەسانەی لە لایەن هێزە تایبەتیەکانەوە ڕەمی کرابن یان کوژرابن بگاتە ٢ ملیۆن کەس کە لەلایەن هێزە تایبەتەکان و بەتالیۆنی پۆلیس و ئەو هێزانەوە کوژرابن کە بەدوای ئەوەدا دەگەڕان زۆرترین ژمارەی جولەکە بکوژن.

گۆڕ هەلکەندن زۆرترین کاتی پێویستە ، لەکاتێکدا کوشتن و ئیعدام کردنەکان خێراترە (١٠٠ کەس بە چل دەقیقە ) . . لەسەرەتاوە سەربازەکانم هیچ باکیان نەبوو. بەڵام لە دوهەم ڕۆژدا یەك دوو کەس توانای ئەوەیان نەما بۆ ماوەیەکی درێژتر لە کوشتن بەردەوام بن. من خۆم وا هەست دەکەم کە مرۆڤ لە کاتی ئەنجامدانی ئیعدامەکاندا هیچ سستیەکی دەرونی توش نایەت. بەڵام پاش چەند ڕۆژێك دوای ئەنجامدانی کارەکە پاش ئەوەی مرۆڤ دەحەوێتەوە ئەوسا ئازاری دەرونیت لێ دەردەکەوێت.

ڕاپۆرتێکی ملازم (والتەر) لە یەکێك لە کۆمەلکوژەییەکانەوە. لە نزیك بەلگراد. ١ی کانونی دوهەمی ١٩٤١

ئیعدام کردنەکان سێ تا چوار سەعاتی خایاند ، خۆم هەموو کاتەکە بەشدار بووم. پشودانەکەم تەنها بۆ گۆڕینی مەخزەنی چەکەکەم بوو. هەر بۆیە زەحمەتە بزانم لە ماوەی ئەم سێ چوار سەعاتەدا چەند جولەکەم کوشتوە ، هەتا ئەو کاتەی یەکێکی تر لە شوێنی من دەست بەکاربوو.
هەریەکەمان بڕێکی زۆر (مەی)مان خواردەوە تا تاقەتمان لەو کارە نەچێت.

ئەلفرێد میتزنر. . سەربازێکی ئەلمانی.

# بەکۆمەل کوشتنی ژن و مندال

لە١٤ی کانونی یەکەمی ١٩٤٢دا کۆمەلێك لە ژنانی جولەکە لەگەل منالەکانیاندا لە گیتۆی (میسوز)ەوە لە ئۆکرانیا بەرەو کەندەلانێکی دەرەوەی ڕاڤۆ بران. لەوێ لەلایەن پۆلیسی ئەلمانی و میلیشیا ئۆکرانیەکانەوە رەمی کران. وێنەکەی (لاپەرە ١٢٦) دەری دەخات چۆن ژنەکان ریزکراون بەرەو ژوور دەکرێنەوە. هێندێکیان کۆرپەکانیان لەباوەش گرتوە. لە وێنەکەی خوارەوەی (لاپەرە ١٢٦)دا، پۆلیسەکان فیشەکی بەزەبی دەنێن بەسەری ئەو ژنانەوە کە تەنها بریندارببوون و گیانیان دەرنەچووە.

(هێرمان ف. گرێبە)ی ئەندازیاری ئەلمانی کاتێك پاش جەنگ لێکۆلینەوەی لەگەل کرا لە وتەکانیدا باسی ڕوداوێکی تری لەو چەشنەی کرد کە لە ٥ی کانونی یەکەمی ١٩٤٢ لە(دوبنۆ)ی ئۆکرانیا ئەنجام درابوو.

"من و مۆنیکی یەك ڕاست چوینە سەر چالەکە. کەس ڕێی لێ نەگرتین. ئێستا دەتوانم گوێم لەو دەستڕێژانە بێت کە لەپشت ئەو گردۆلکەیەوە دەکرێن. ئەو کەسانەی دەبرێن بۆ ئەوێ – ژن و پیاو و منـدالان دەبێت جلـەکانیان داکەنن بەفەرمانی ئەو ئەفسـەرانەی ئیـس.ئیـس. کە هەریەکەیان قامچیەکی بەدەستەوەبوو. خەلکەکە دەبـوو خۆیـان ڕووت بکەنـەوە و جـل بـەجیا، پیلاو بەجیا، جلی ژێرەوە بەجیا، کۆمەلێك پیلاوم چـاو پێکەوت کە بـە ٨٠٠–١٠٠٠ جـوت مەزەندە دەکرا. کۆمەلێکی زۆریش جل و بەرگ هەلدرابۆوە.

بەبێ گریان و قیژە ئەو خەلکانە ڕووت دەکرانەوە و خێزان خێزان ڕیزدەکران. خواحافیزیان لەیەك دەکـرد و بەیـەکتریان دەگـوت خواتـان لەگـەل بێـت. چـاوەڕێی ئیشـارەتی ئەفسـەرەکەی ئیس.ئیس. یان دەکرد کە لەسـەر لێواری کەندەلانەکە وەستا بوو قامچیەکی لەمشت بوو. لە ماوەی ئەو چارەکە سەعاتەی من لە نزیك ئەو چالەوە وەستام، گوێم لە کەس نەبوو بپارێتەوە یان داوای عەفوکردن بکات. چاوم لـە خێزانێکی هەشـت کەسـی بـوو ژن و پیـاوێك هـەر یەکەیان لەتەمەنی پەنجا سالیدا بوو لەگەل مندالەکانیان کە لە نێوان یەك تا هەشت، تا دە سالان دەبوون و دوو کیژۆلەی گەورەی تەمەن ٢٠ تا ٢٢ سالانیان لەگەل بوو. پیرێژنێکی سەرسپی وەك کلوی بەفر منداله یـەك سـالانەکەی لـەباوەش گرتبـوو گۆرانـی بـۆ دەگـوت و ختوکـەی دەدا. مندالەکـەش

لەخۆشـیاندا پێدەکـەنی و قاقـای لـێ دەدا. ژن و مێردەکـە بـەچاوی پـڕ فرمێسـکەوە تەماشـایان دەکردن. باوکەکە قۆلی کوڕە تەمەن دە سـاڵانەکەی گرتبـوو و بـە ئەسـپایی قسـەی بـۆ دەکرد. کوڕەکەش هـەولی دەدا فرمێسـکەکانی نەیەنـەخوارێ. باوکەکـە سـەری بـەرز کـردەوەو بـە پەنجـە ئیشـارەتی بۆ ئاسمان دەکـرد و لـەوە دەچـوو شـتێکی بـۆ بـاس بکـات. . . لەوکاتـەدا یـەکێك لـە سەربازانی ئیس.ئیس. کە نزیك چاڵەکە بوو بانگی یەکێك لە هاورێکانی کرد، ئەویش نزیکەی بیست کەسی جیاکردەوە بۆ پشت گردەکە راپێچی کردن. ئەو خێزانەی کە ئێستا باسم کردن لەنێو ئەو بیست کەسەدا بوون. تا ئێستا لەبیرمە کە چۆن کیژۆلەکە باریکەلەو پرچ ڕەش سـەیری منی کرد و ئیشارەتی بۆ خۆی کرد و وتی: بیست و سێ ساڵم"

## لە هێزە تایبەتەکانەوە بۆ کارگەکانی مەرگ. .

ڕەمی کردنی بەکۆمەڵی سەدان هەزار کەس و کوشتنیان کە لەلایەن هێزە تایبەتەکانەوە ئەنجام دەدران. هێندێك کێشـەیان دروسـت دەکرد، سـەرنجی خـەڵکیان ڕادەکێشاو کاری خراپی لەسـەر باری دەروونی سـەربازەکان دەکرد و زۆریش بەخاوی دەچوو بەڕێوە و چونکە ژمارەیەکی یەکجار زۆر بڕیاربوو لەناوببرێن. لە پایزی ١٩٤١ەوە ئەلمانیـەکان خـەریکی پشـکنین بوو بـەدوای ڕێگایـەکی ترداو لە کۆتاییدا ڕێیەکی کاریگەرتریان دۆزیەوە بۆ کوشتنی چەند هەزار کەسێك لەڕۆژێکدا. پاش ئەنجامدانی چەند تاقیکردنەوەیەك لەگەڵ تەقەمەنی، چارەیان بۆ دۆزیەوە. . گاز. لە بەرنامەی T4 کـە لـە (سـەنتەرەکانی بـەزەیی) بـەکاردەهات و یەکـەم ئۆکسـیدی کاربۆنیـان دەکـردە لولـەکی (ئیستوانە)ی ئاسنەوە و بەکاریان دێنا. بەڵام ئەمەش بەکەڵکی کوشتنی ئەو ژمارە زۆرە نەدەهات هەتا سەرەتاکانی ١٩٤٢ و لە ٨ی کانونی یەکەمی ١٩٤١دا لە ئۆردوگای (چێلمنۆ) ئەو دوکەڵەی لە ئەگزۆزی چەند سەیارەیەکەوە دەهاتە دەرێ کە تایبەت بۆ ئەو مەبەسـتە دروسـتکرا بوون بۆ یەکەم جار بەکارهات. لـە ١٧ی مـارس ١٩٤٢دا ژوورەکانی گـاز لـە ئۆردوگـای بەکۆمەڵکوشـتنی (بـەلزاك)دا ئامـادەکرا بـوون بـۆ وەرگرتـنی یەکـەم شـەمەندەفەری پـڕ لەجولەکـە کـە لـە گێتـۆی (لوبلین)ەوە هاتبوون. لە ئۆردوگاکانی (بلزاك، سۆبیبۆر و تریبلینکا) ئەو دوکەڵەی لە ئەگزۆزی دەبابـە گەورە ڕوسیەکانەوە دەهاتە دەرێ بەکاردەهێنرا بۆ خنکاندنی خەڵك. ئەو کەسـانەی لەم

سێ ئۆردوگایەدا کاریان دەکرد تەنها ١٠٠ کەس بوون کە کاتی خۆی لەسەر تاقیکردنەوەی T4 کاریان کردبوو.

لە پایزی ١٩٤١دا چەند تاقیکردنەوەیەك لەسەر ئۆردوگای ئاوشویز بە بەکارهێنانی گازی (زایکلۆن بی) ئەنجامدرا، (کەخۆی دەرمانێکە بۆ لەناوبردنی ئەسپێ و مۆرانە بەکاردێت). ئەویش سەلماندی کە زۆر بەکارە بۆ کوشتنی مرۆڤیش. ئەو گازەی کە لێی بەرز دەبێتەوە بەئاسانی ئەو کەسانە دەکوژێت کە هەلیدەمژن. هەر بەم شێوەیەش بەکۆمەلکوشتن بە بەکارهێنانی گازی زایکلۆن بی لە ئۆردوگای ئاوشویز بو بە کارێکی رۆژانە. بەکارهێنانی گاز هەروەها لە ئۆردوگای (ماجدانکێ)ی دەرەوەی لۆبلین و لە چەند ئۆردوگایەکی تری ئەلمانیادا ئەنجام درا.

بە بەکارهێنانی ئەم کەرەسە پیشەسازیانە، ژمارەیەکی کەم لە هێزەکانی ئێس.ئێس. و یارمەتیدەرەکانیان توانیان لە ماوەی نێوان کانونی یەکەمی ١٩٤١ تا ئەیلولی ١٩٤٤ نزیکەی سێ ملیۆن مرۆڤ بکوژن.

مەترسی تەندروستی بۆ سەر ئەو کەسانەی سەیارەی گازەکانیان ئیش پێ دەکرد

ئەمەی خوارەوە چەند برگەیەکە لە راپۆرتێکی (ملازم ئاوگۆست بیکر)ی ئەفسەری ئیس. ئیس. وەرگیراوە دەربارەی ئەو یەکەی گازە تایبەتیانەی لە ئۆردوگاکانی ئۆکرانیا، سربیا و چێلمنۆ بەکاردەهاتن.

بەتەواوی فەحسی سەیارەکانی هەر دوو گروپی ئینساتز D,C تەواو بوو. سەیارەکانی گروپی D گۆریمان بەشێوەیەك وەك کەرەڤانی شەمەندەفەری لێ هات و بەوەی تاکە پەنجەرەیەکمان لە هەردوو لای کەرەڤانە بچکۆلەکەوە کردۆتەوە. لە گەورەکەشدا دوو پەنجەرەمان کردۆتەوە تا وەك خانویەکی ناو کێلگە بێتە پێش چاو. کەرەڤانەکان بەشێوەیەك ناوبانگیان دەرکردوە کە نەك هەر بەرپرسەکان بەلکو هەر کە دەرکەوتن خەلکی سادەش دەڵێن ئەوە کەرەڤانەکانی مەرگن. هەر بۆیە من پێم وایە ئەم کەرەڤانانە ئاشکرابوون و چیتر کارەکانیان ناشاردرێتەوە ئەگەر چی داشیان دەپۆشین.

هەروەها من پێشنیار دەکەم کە ئەوکەسانەی لەسەر ئەو کەرەڤانانەن کاردەکەن چەند بۆیان دەکرێت لە کەرەڤانەکان دوور بوەستن لەکاتی گاز تێ کردنیاندا چونکە مەترسی بۆ سەر تەندروستیان هەیە بەوەی کە کەرەڤانەکان گازیان لێ دەچێت (واتە گازیان لێ دێتەدەرەوە). هەروەها پێم باشە بەم بۆنەیەوە سەرنجی ئەمانەی خوارەوە بدرێت.. هێندێك لە هێزە تایبەتیەکان رێیان بە پیاوەکانیاندا کە پاش بەکارهێنانی گاز، کەرەڤانەکان خالی بکەنەوە. من مەترسی ئەو کارەم بۆ فەرماندەکانیان روونکردەوە و باسی مەترسی گەورەی دەرونی و جەستەیی بۆ سەر سەربازەکانیانم بۆ کردن، ئەگەر یەکسەر کاریان تێ نەکات رەنگ هەیە لەپاشاندا کاریان لێ بکات. هێندێك لەو سەربازانە توشی سەریەشە بوون پاش داگرتنی باری کەرەڤانەکان و دیارە ناشکرێت فەرمانەکان بگۆرێت چونکە گەر بەندکراوەکان خۆیان بەکاربێن بۆ ئەنجامدانی ئەوکارە ئەوا ئەگەری هەلاتنیان هەیە. داوای رێ و شوێنی گونجاوی تر دەکەم تا سەربازەکان لەو مەترسیانە بپارێزرین.

بەکارهێنانی گاز لەراستیدا بەو شێوە رێکوپێکە ئەنجام نەدرا لەبەر پەلە پەل بۆ ئەنجامدانی کارەکە. شۆفیرەکەیان چەند توانیان پێیان دەنا بە پێدل ی گازدا (ئەگسەلەریتەر)ەکەدا و بەم شێوەیەش خەلکەکەی ناو ژوورەکان بەدوکەل دەخنکان نەك بەسەرگێژ بوون وەك لەپێشەوە نەخشەی بۆ دارێژرابوو. ئەگەر ئەوەی من نەخشەم بۆ کێشاوە جێبەجێ بکرێت ئەوا کارەکە خێراتر دەبێت و

بەندكراوەكانیش بە هیـواشی بەلادا دێن وە بەئارامی خـەویان لیّ دەكـەوێت. نـەدەم و چاویـان تێـك دەچێت و نە پیسابی دەكەن بەخۆیاندا وەك ئەوەی ئێمە بینیمان. ئەمڕۆ من گەشتەكەم درێژە پێ دەدەم و دەچم بۆ (ئینسساتز) گروپی B گەر هەر شتێكتان پێویست بوو لەویّ پەیوەندیم پێوە بكەن.

"بەدرێژایی ئەو زستانە ، منداڵە بچكۆلە مل ڕوت و پێ خاوسەكان، دەبوو لەو بەرسەرمایە چەندین سەعات بوەستن تا نۆرەیان بگاتە سەر و بخزێنە ناو ژووری گازەوە. بنی پێیان دەیبەست و بە سەهۆڵی زەویەكەوە دەنوسا.

دەوەستان و دەگریان، هێندێكیان لەسەرمان ڕەق بونەوە و هەر لەو كاتانەدا ئەڵمان و ئۆكرانیەكان و ئەمسەر و ئەو سەریان دەكرد بە تەنیشت ڕیزەكانداو شەقیان لەو كلۆلانە هەڵدەدا.

یەكێك لە ئەڵمانیەكان، پیاوێك كە ناوی (سێب) بوو، هەتا بڵێی بەدفەڕو دڕندەبوو و زۆر كەیفی بەوە دەهات كە ئازاری ئەو منداڵانە بدات. كاتێك پاڵی بەژنانەوە دەنا و ئەوانیش لێی دەپاڕانەوە كە وازیان لێ بێنێ چونكە منداڵیان پێیەو زۆر جار منداڵەكانی لەدەست دەردێنان و دەیكردن بەدوو كەرتەوە و یان لەقاچەوە منداڵەكەی هەڵدەگرت و ڕایدەوەشاندن و كەللەیانی دەكێشا بەدیوارەكەدا و لاشەكەیانی دوور فڕێ دەدا. "

یانكل ویرنیك یەكێك لەوانەی لە تریبلینكا ڕزگاری بوو بوو.

## پرۆسەی ڕەینهاردت

لە ماوەی نێوان مارسی ١٩٤٢ تا کانونی یەکەمی ١٩٤٣ نزیکەی ١,٧ ملیۆن خەڵك لە ئۆردوگاکانی مەرگ لە بەلزاك، سۆبیبۆر، تریبلینکا لەناوبران. ئەو ئۆردوگایانە بەشێك بوو لە پرۆسەی ڕەینهارد "Operation Reinhardt" بەمەبەستی چۆڵکردنی پۆڵەندا لە جولەکە، هەموو موڵك و سامانیشیان تاڵان کرا. هیچیان نەهێشتەوە، بێجگە لە جل و بەرگ، پارە، کەلوپەلی تایبەتی، لاشەکانیان و قژی سەر و کیفی ئالتونی دانەکانیان. هەموو شتێك، نەیانهێشت هیچیان لە کیس بچێت. ئەم کارانە و شاردنەوەی لاشەی کوژراوەکان بە ١٠٠٠ بەندی جولەکە ئەنجام دەدران.

ئۆردوگاکان بچکۆلە بوون، ڕوبەرەکەیان ٦٠٠ مەتر درێژی و نزیکەی ٤٠٠ مەتر پانی بوو. نزیکەی ٣٠ سەربازی ئەڵمانی سەرپەرشتی ئۆردوگاکەیان دەکرد و ١٠٠ کەسی ئۆکرانی یان بەلتیقی یارمەتی دەدان. ئەو سێ ئۆردوگایە زۆر لێکەچوون و بە پێی گوتەی ئەفسەرێکی پێشوی ئێس.ئێس. دواکەوتوو بوون بەڵام ماشێنێکی کارابوون بۆ خەڵك کوشتن و هەمیشە لەگەڕدا بوون. قوربانیەکان بەهۆی شەمەندەفەرەوە دەهێنران و زۆر جار لە واگۆنی داخراودا دەیانهێنان. لەناو کامپەکاندا هیچ دکتۆرێك نەبوو تا قوربانیەکان وەك ئەوەی ئاوشویتز و ماجدانکێ جیا بکاتەوە.

بەو خەڵکەیان دەگوت کە بۆ کارکردن ئەوانیان هێناوە بەڵام دەبێت لەپێشەوە جلەکانیان داکەنن تا تەعقیمیان بکەن و پاشان خۆیان بشۆن. پیاوان بۆ لایەك و ژن و منداڵیش بۆ لایەکەی تر و بەزۆر ڕوتیان دەکردنەوە و ئەوەی پێیان بوو دەبوایە تەسلیمی بکەن و پاشان بەرەو ژوورەکانی گاز مل بنێن. مەکینەکان دەخرانە گەڕ و دوکەڵی ئەگزۆزەکان دەکرایە ناو ئەو ژوورە پڕ لە خەڵکانەوە. هەموو پرۆسەکە بە سەعاتێك یان دوو کۆتایی دەهات. وەك ئەفسەرەکەی ئێس.ئێس. باسی دەکات لە تریبلینکا دەتوانرا پتر لە ١٥,٠٠٠ خەڵك لە یەك ڕۆژدا بکوژرێن. هەتا نیوەشەو کارمان دەکرد، لە سەرەتادا لاشەکانمان لە نێو چاڵی گەورە گەورەدا دەشاردەوە و بەڵام لە پایزی ١٩٤٢ەوە دەست بەسوتاندنی لاشەکان کرا.. ژمارەیەکی زۆر کەم لە پرۆسەی ڕەینهاردت ڕزگاریان بوو. تەنها کەمتر لە ١٠٠ جولەکە لە تریبلینکا ڕزگاریان بوو لە سۆبیبۆر کەمتر لە پەنجا کەس گەڕانەوە و لە بەلزاك تەنها دوو کەس.


THE EXTERMINATION CAMPS
Death camps
Death and slave-labour camps
SWEDEN (neutral)
Copenhagen
Ystad
THE BALTIC
Riga
THE BALTIC COUNTRIES
REICH COMMISSARIAT OSTLAND
Minsk
Danzig
NAZI GERMANY
BIALYSTOK
Berlin
Vistula
TREBLINKA
Pripjat
CHELMNO
Warsaw
SOBIBOR
Elbe
Lodz
Lublin
MAJDANEK
Odra
GENERAL GOVERNMENT
REICH COMMISSARIAT UKRAINE
Prague
Krakow
BELZEC
BOHEMIA/ MORAVIA
AUSCHWITZ
SLOVAKIA

## چەند تێبینییەکی نوسراو لە ترێبلینکا

ئاگاداری بۆ جولەکەکانی وارشۆ !

ئێستا ئێوە هاتونەتە ئۆردوگایەکی کاتیەوە (ترانزێت) و دەگوێزرێنەوە بۆ ئۆردوگای کارکردن..

بۆ خۆپاراستن لە نەخۆشی پێویستە هەموو جلەکانتان داکەن تا تەعقیم بکرێن. ئەو ئالتون و خشل و پارە بیانیانەی پێتانە لە لای خەزێنەدار تەسلیمی بکەن و وەسلێکی لێ وەربگرن. پاشان بە هەمان وەسلی شتەکانتان وەردەگرنەوە.هەموو ئەوانەی دەگەنە ئێرە پێویستە خۆیان بشۆن پێش ئەوەی گەشتەکەیان دەست پێ بکەنەوە.

ئۆردوگاکانی مەرگ و ژمارەی قوربانیەکانی هەریەکەیان

| | |
|---|---|
| چێلمنۆ | |
| کانونی ای ١٩٤١ - تەموزی ١٩٤٤ | ٣٢٠,٠٠٠ - ١٥٢,٠٠٠ |
| بەلزاك | |
| مارسی ٤٢ - کانونی ای ٤٢ | ٦٠٠,٠٠٠ |
| سۆبیبۆر | |
| نیسانی ٤٢ - کانون ای ٤٣ | ٢٥٠,٠٠٠ |
| ترێبلینکا | |
| تەموزی ٤٢ - ئابی ٤٣ | ٩٠٠,٠٠٠ - ٧٠٠,٠٠٠ |
| ماجیدانکێ | |
| تشرینی ای ٤١ - تەموزی ٤٤ | پتر لە ٣٦٠,٠٠٠ |
| ئاوشوێز بیرکناو | |
| کانونی ٢ی ٤٢ - کانونی ٢ی ٤٥ | پتر لە ١,١٠٠,٠٠٠ |

# کارگەی مەرگ لە ترێبلینکا

گەیشتنە ترێبلینکا. ژوورەکانی گاز دەکەونە دەرەوەی ئەو وێنەیە (لاپەڕە ١٣٥)، پشت ئەو پۆلە درەختەی لە وێنەکەدا دیارن. (ڕێگای بەهەشت) دەکەوتە پشت کۆتایی قاعە درێژەکەی لای چەپ، (ئەو ناوە ئەڵمانیەکان بۆیان دۆزیبۆوە) دەچوە نێو ژوورەکانی گازەوە. لەو ساحە فراوانەی لەناوەڕاستدا دیارە شوێنی جیاکردنەوەی کەلوپەلەکانە، کۆمەڵێك جل و بەرگی بەجێماوی ئەو قوربانیە کڵۆڵانە شاخێکیان دروست کردوە. لەپشتەوە مەکینەیەکی گەورەی چاڵ هەڵکەندن دیارە، کە چاڵی گۆڕە بەکۆمەڵەکانی هەڵدەکەند بۆ ئەو کەسانەی بەگاز دەکوژران. نزیکەی یەك ملیۆن مرۆڤ هێنرانە ترێبلینکا بەڵام لەوانە تەنها سەد کەسیان ڕزگاریان بوو.

ئەو وێنەیە لەلایەن سامۆئیل وێلنبێرگ ەوە دروست کراوە، کەخۆی یەکێك بوە لەوانەی لە ترێبلینکا ڕزگاری بوە. لە کتێبەکەی خۆیدا بەناوی (یاخی بونێك لە ترێبلینکادا) بڵاوی کردۆتەوە. ئەو خۆی چەند جارێك ناچار کراوە تا پرچی ئەوژنانە ببڕێت کە دەیانبردن بۆ ناو ژووری گازەکان. هەروەها بەشداربوە لە جیاکردنەوە (پۆلێن) کردنی ئەو کەلوپەلانەی بەکەڵك دێن و ئەو شتانە دەگەڕانەوە بۆ ئەڵمانیا. وێلنبێرگ هەروەها بەشداری ئەو یاخی بونەی نێو ترێبلینکا کردوە کە ڕۆژی ٢ی ئابی ١٩٤٣ ڕویداو توانی خۆی دەرباز بکات و بگەڕێتەوە بۆ وارشۆ و پەیوەندی بکات بە بزوتنەوەی بەرگری نەتەوەیی پۆڵەنداوە و لەگەڵیاندا بەشداری ئەو ڕاپەڕینەی ئابی ١٩٤٤ی کرد.

# فرانز ستانگل

لەو موناقەشانەدا کە دەربارەی قەتڵ وعام و ئەو کۆمەڵکوژیە دەکرێن، هۆیەکەی دەگێڕنەوە بۆ ئەو پیاوکوژانەی لەپشت کورسیەکانەوە دادەنیشتن و فەرمانیان دەدا تا مەکینەی کوشتار هەر لە کاردا بێت. هەر وەك (کریستۆفەر برۆوینگ)ی مێژوونووس دەڵێت "قەتڵ و عام بەو فراوانیە ڕویدا چونکە هۆی بنەڕەتی ئەوەبوو کە خەڵکانێك هەبوون مرۆڤی تر بکوژن، ژمارەیەکی زۆر و بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ ئەو کارە ئەنجام بدەن"

هەتا سەرکردەی ئۆردوگاکانیش وەك ئێمە مرۆڤ بوون. (فرانز ستانگل) یەکەم سەرکردەی ئۆردوگای سۆبیبۆر و پاشان تریبلینکا بوو. لە ساڵی ١٩٦٠دا لە بەرازیل دەستگیرکرا و ڕەوانەی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا کرایەوە تا بدرێت بەدادگا بەتاوانی کوشتنی سەدان هەزار مرۆڤ[٢٨]. ئەو لەکاتێکدا بەڕێوەبەری ماشێنێکی گەورەی مرۆڤ کوشتن بوو لە هەمان کاتیشدا باوك بوو مێرد بوو. ئەم چەند بڕگەیەی خوارەوە باسی ئەگەرێك دەکات کە نەهاتۆتە دی و چونکە لەکاتی جەنگدا هەرگیز پرسیاری لەم جۆرە نەکراوە. ڕۆژنامەنوسێك چاوپێکەوتنی لەگەڵ (ستانگل)ی ژنی فرانز ستانگلی کرد و ئەم پرسیارەی ئاراستە کرد "ئەتوانیت پێم بڵێیت (..) بە ڕای تۆ چی ڕوی دەدا ئەگەر ڕۆژێك تۆ مێردەکەت بخستایە نێوان دوو هەڵبژاردنەوە، پێت بوتایە. من ئاگادارم ئەوەی تۆ ئەنجامی دەدەیت شتێکی ترسناکە و دەبێت یان وازی لێ بێنیت و چی تر ئەو کارانە ئەنجام نەدەیت ئەگینا من و منالەکانت بەجێت دێلین! "تێریزا ستانگل لە وەڵامدا وتی" من پێم وایە ئەگەر کاتی خۆی من پێم بوتایە لە نێوان تریبلینکا و ئێمەدا یەکێك هەڵبژێرە.. ئەو.. بەڵێ ئەو بێگومان ئێمەی هەڵدەبژارد"

بەڵام لەڕاستیدا مێردەکەی کوشتن و قەتڵ و عامی پتر لە نیو ملیۆن مرۆڤی هەڵبژارد.

# مەرگ لە کاتی ئیشکردندا

ئەڵمانەکان زۆر جار جولەکەکانیان بەوە دەکوشت کە پێیان دەوت (کوشتن بەئیشکردن). لە بارودۆخی زۆر دژواردا بەندکراوەکان ناچار دەکران کە کاری زۆر گران و بێ مانا ئەنجام بدەن و لەگەڵ ئەوەشدا خواردنی زۆرکەمیان دەدرایەو باری تەندروستیان گەلێك خراپ بوو لە سەرو هەمووشیانەوە دڵ ڕەقی و دڕەندەیی پاسەوانەکان کە لە تۆڵەی بچوکترین هەڵە ئەگەر چی زۆر بچوکیش بوایە ئەوا سزایەکی زۆر گرانی ئەو بەندکراوانە دەدرا و ئەمەش بووە هۆی ئەوەی دەیان هەزار کەس لەناو ئەو ئۆردوگایانەدا گیانیان لەدەست بدەن.

جۆزیف شۆباك، یەکێك بوو لەو بەندکراوەی ئۆردوگای مەرگ و کاری (ماجیدانکێ). ئەو بەم شێوەیە وەسفی ئەو کارە ناهەموارانە دەکات کە پێیان دەکردن.

"پاشان چوین بۆ ئیش کردن بە پێڵاوە تەختەکانمانەوە. بە تێهەڵدان بردیانیە گۆشەیەکی کێڵگەکەوە و قوڕ و بەردمان دەگواستەوە، هێندێك جار دەبوو شەپقەکانمان یان کراسەکانمان پڕ بکەین لە قوڕ و بەرد و بەهەر دوو دەست هەڵیبگرین و بەڕاکردن و لەژێر لێدانی قەمچی و داردا بیبەین بۆ گۆشەکەی تری کێڵگەکە، لەوێ کۆڵەکانمان بەتاڵ بکەین و هەر لەوێ پڕیان بکەینەوە زۆر بەخێرایی بیبەینەوە بۆ گۆشەکەی ئەوسەر. بەو شێوەیە دەبوایە لەژێر هاوار و نەڕەی ئەفسەرانی ئێس.ئێس. و بەندکراوە تایبەتیەکاندا کە هەر یەکەیان تێلایەکی بەدەستەوە بوو پیایاندا دەکێشاین بەڕاکردن ئەمبەر و ئەوبەر بکەین. بەڕاستی ئەوە دۆزەخی ڕاستەقینە بوو"

"بۆ یەکەم جارە تا سەعات سێی بەرەبەیان لە دەرەوە بمێنمەوە (کارێکی تایبەتە – Special action) گەر بەراوردی دۆزەخەکەی (دانتی) لەگەڵ ئەمەی ئێرەدا بکەین ئەوا ئەو دۆزەخەی دانتی دەبێتە قۆشمەجاڕی. بەڕاستی ناونانی ئاوشویتز بە ئۆردوگای مەرگ هەروا لە خۆڕا نەهاتوە."

(..)

بەشداری لەکارێکی ئاوادا کە لەسەر ئەو ژنە بەندکراوانە ئەنجام دەدرا (..) کارێکی تۆقینەرە. من لایەنگری بۆچونەکەی (تیلۆ)م کە دەیگوت.. ئێمە دەکەوینە نزمترین شوێنی دنیاوە، لە ژێری ژێرەوەبن. (ئێمە دەکەوینە پاشەڵ (قنگی) دنیاوە)

لە بیرەوەریەکانی جۆن پ. کرێمەر کە پزیشکێکی ئێس.ئێس. بوو لە ئۆردوگای مەرگ ی ئاوشوێز بیرکناودا کاری دەکرد..

٢ی ئەیلولی ١٩٤٢.

## ئاوشویٚز بیرکناو

له سالّی ١٩٤١دا ئەڵمانیەکان ئاوشوێز بیرکناویان دروست کرد وەك ئۆردوگایەك بۆ بەندکراوە سیاسیەکانی پۆڵەندا. ئەم ئۆردوگایە دەکەوتە نزیك دوڕیانی هێڵی شەمەندەفەری سەرەکی. پاش ماوەیەك ئەو ئۆردوگایە فراوانکراو گەورە بوو کە بوە ٤٠ بەشی جیاواز، لە هەموویان بەناوبانگتر ئاوشوێز ١ (ستاملاگەر)، ئاوشوێز ٢ (بیرکناو)، ئاوشوێز ٣ (مۆنۆویتز). ژمارەیەکی زۆر لە پزیشك لە ئۆردوگاکە بەگەرمی کاریان دەکرد تاقیکردنەوەیان لەسەر بەندکراوەکان ئەنجام دەدا ناویان لێ نابوو (تاقیکردنەوەی زانستی پزیشکی).

کۆمەڵکوژی بەگاز لە کۆتایی سالّی ١٩٤١ لە ئاوشوێز دەستی پێ کرد، پاشان لە بەهاری ١٩٤٢دا لە بیرکناو دەستی پێ کرد، بەوەی دوو ماڵی بچکۆلەی ناو کێڵگەیەکیان چاك کردبوو تا وەك ژووری گاز بەکاریان بێنن. پاشان لە سەرەتای بەهاری ١٩٤٣ەوە، هۆڵی گەورە و تایبەتی و پێشکەوتوو کە تایبەت بۆ ئەو مەبەستە دروستکرا بوو خرانەگەڕ (چوار دانەی لێ بوو هەرچواریان ژووری گازیان لەگەڵدا بوو). پرۆسەی کۆمەڵکوژی گەورە لە بەهار و هاوینی ١٩٤٤دا دەستی پێ کرد کاتێك کە شوێنەکانی نوێ کرانەوە و چاك کران، کۆمەڵکوژیەکە بەڕادەی ١٢,٠٠٠ جولەکە بوو لە ڕۆژێکدا کە لە هەنگاریاوە دەگەیشتن. لەو ماوەیەدا هەموو ڕۆژێك ٣-٤ شەمەندەفەری پڕ لە خەڵك دەگەیشتن کە یەکی ٣,٥٠٠ - ٣,٠٠٠ کەسیان بار کردبوو. یەك لەسەردەی ئەوانە هەڵدەبژێردران بۆ ئیشکردن، ئەوانەی تر یەکسەر دەبران بۆ گاز پێوەکردن. لەگەڵ ئەو هەموو چاك کردن و فراوان کردنەشدا هێشتا فڕنەکان و شوێنەکە فریای ئەو هەموو کوشتارەو شاردنەوەی مەیتەکان یان سوتاندنیان نەدەکەوتن، هەر بۆیە چەندین هەزار لەو لاشانە لە چاڵی تایبەتدا و لە دەرەوەی ژوورەکان دەسوتێنران. دوا کۆمەڵە خەڵك کە بە گاز کوژران لە تشرینی دوهەمی ١٩٤٤دا بوو. . پێش ئەوەی لە کانونی دوهەمی ١٩٤٥دا سوپای سۆڤیەت ئۆردوگاکە ئازاد بکات هێزەکانی ئێس.ئێس. فڕنەکانیان هەڵوەشاند و بردیان. تا ئێستاش ئاسەوارەکانی ئەو شوێنانە بەدی دەکرێن.

بەلایەنی کەمەوە یەك ملیۆن جولەکەی ئەوروپا لە ئاوشوێز کوژران هەروەها نزیکەی ٧٥.٠٠٠ پۆلەندی، ٢١,٠٠٠ قەرەج، ١٥,٠٠٠ دیلی جەنگی سۆڤیەتی، و ١٥,٠٠٠ ی تر لە خەڵکی شوێنەکانی تر لە ئاوشوێز لەناوبران. لەم کامپەدا بەلانی کەمەوە ١,١ ملیۆن کەس بونە قوربانی.

چەند وێنەیەكی بیركناو لەكتێبەكەدا

A. بەشی سەرەوەی ڕاڕەوەكە. (لاپەڕە ١٤٤)
B. ژن و منداڵ لە دەرەوەی فڕنی ٢ (لاپەڕە ١٤٦)
C. ژن و منداڵ بەڕێوەن بۆ فڕنی ٤ یان ٥ (لاپەڕە ١٤٩)
D. ڕەسمەكانی بەرگەكە.

بینا و شوێنە گرنگەكانی ئۆردوگاكە

١. ڕاڕەوی هەڵبژاردن.
٢. فڕنی ژمارە ٢ لەگەڵ ژووری ژێرزەمینی گاز.
٣. فڕنی ژمارە ٣ لەگەڵ ژێرزەمینێك بۆ گاز.
٤. فڕنی ژمارە ٤ لەگەڵ ژوورێكی گازدا.
٥. فڕنی ژمارە ٥ لەگەڵ ژوورێكی گاز و چاڵێك بۆ سوتاوەكان.
٦. (ساونا) تۆماركردنی ناوەكان.
٧. كەنەدا - تۆماركردنی شتەكان
٨. كەپر یان قاعەی نەخۆشەكان.
٩. ئۆردوگای خێزانی قەرەجەكان.
١٠. بەشی پیاوان (ئۆردوگای پیاوان).
١١. ئۆردوگای ژنە جولەكە هەنگاریەكان.
١٢. ئۆردوگای خێزانە جولەكەكانی تێریسێنستادت.
١٣. ئۆردوگای ژنان.
١٤. بینای تاقیكردنەوە پزیشكییەكان.
١٥. (دەرگای مردن) خاڵی چونە ژوورەوەی شەمەندەفەرەكان.

"هەڵبژاردن"



ئەمە یەکێکە لەو چەند وێنەیەی پرۆسەی بژارکردن لە ئۆردوگای بیرکناودا. زۆربەی ڕزگاربوەکان دەیگێڕنەوە کە ئەو ساتانە چۆن مانای لەناوچوونی خێزانەکانیان دەگەیێنێت. دکتۆرەکانی ئێس.ئێس.ی ئەڵمانیا لەگەڵ ئەفسەرەکاندا ئەو کەسانە جیادەکەنەوە کە دەچن بۆ ناو ئۆردوگاکان بۆ کارکردن. لەلای سەرەوەی وێنەکە ڕیزی ئاپۆرەی خەڵك کە زۆربەیان ژن و منداڵن و پیر و بە تەمەنیشیان تیادا بەرچاو دەکەوێت. بەڕێوەن بۆ ژوورەکانی گاز لە فڕنی ۲.

## ٢٠٠ دووسەد وێنەکەی بیرکناو

بەشێوەیەکی ڕەسمی گرتنی وێنەی ئەو جولەکانەی دەکوژرێن قەدەغەبوو، بەڵام زۆر کەس وێنەیان دەگرت. بەتایبەت لەکاتی ڕەمی کردنی بەکۆمەڵدا. هێندێك لە ئەفسەرەکان پێیان خۆش بوو ئەو وێنانە بەرنەوە بۆماڵەوە و پیشانی خێزانەکانیان یان هاوڕێکانیانی بدەن. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ژمارەیەکی زۆر کەم لەو وێنانەی ئۆردوگاکانی مەرگ ماونەتەوە. هەر بۆیە ئەلبومی وێنەکانی (نیشتەجێ کردنەوەی جولەکە هەنگاریەکان – The resettlement of hungarian Jews) یەکێکە لە دۆکیومێنتە نایابەکان. لە یەکێك لە ئۆردوگاکاندا پاش جەنگ دۆزرایەوە[٣٠]. وێنەکان زۆربەیان لەوە دەچن لە کۆتایی مایسی ١٩٤٤دا یان سەرەتای حوزەیراندا گیرابن، کاتێك گواستراوەکان لە هەنگاریاوە خێرا خێرا دەگەیشتن. تا ئێستا نەزانراوە، کێ ئەو وێنانەی گرتووە. وێنەکان بەپێی ڕۆژەکان ڕیزکراون و لە ژێرەوە بەدەست خەت لێیان نوسراوە. یەکێك لە نوسینەکان "گەیشتنی شەمەندەفەرێکی پڕ" لە وێنەکانی تر بەپێی تسلسل نوسراون" هەڵبژاردن، ئەو پیاوانەی بەکەڵکی کارکردن دێن، ئەو ژنانەی بەکەڵکی کارکردن دێن و ئەو پیاوانەی کەڵکی هیچیان پێوەنەماوە، ئەو ژن و منداڵانەی بەکەڵکی هیچ نەماون، گواستراوە بۆ ئۆردوگاکانی ئیش، لە کۆتاییدا "شتومەکەکان" دوای ئەو سەردێڕە وێنەی بڕێکی یەکجار زۆر لە جلوبەرگ و پێڵاو و شتی تر.. هتد. دوو وێنەی کۆتایی ئەلبومەکە وێنەی دوو فڕنە کە لە یەکێك لە ئۆردوگا بچکۆلەکاندا گیراوە، لێیان نوسراوە "بەکەڵکی کارکردن دێن" هێزی کارکردنیان تێدایە، ئەوانەی بەکەڵکی کارکردن نەماون "پیرەکان و پەککەوتە و هانیکاپ و منداڵ و ژنی منداڵبەر، ئەوانە یەکسەر بەرەو فڕنی گاز ڕەوانە کراون. لە بەرگی ئەم کتێبەشدا ئەم لاپەڕەیە و لاپەڕەکانی دوایی ئەو وێنانەی تێدایە کە لەژێر سەردێڕی (پۆلێن – جیاکردنەوە)ی "ژن و منداڵ و ئەوانەی کەڵکیان نەماوە" دانرابوون.



ئەو ژن و منداڵانەی چیتر بەکەڵك نایەن لەبەر دەرگای فڕنی ٢ وەستاون و ڕەنگە سەعاتێك یان کەمتریان لە ژیان مابێ. پێش ڕۆژئاوابوون ئەم ژن و منداڵانە لەناو دەبرێن و ڕەنگە بین بە خۆڵەمێش - بەهۆی ئەو پرۆسە پیشەسازیە پێشکەوتووەوە. لەو شوێنەی ئێستا لێی وەستاون بەناو باخچەیەکی بچکۆلەدا ڕەت دەبن، پاشان بە پلیکانەیەکی کەمدا دەچنەخوارێ بۆ ناو ژوورێکی گەورە. لەوێ بەزۆر جلیان لەبەردا دەکەنرێ، پاشان دەبرێنە نێو ئەو ژووری گازەی جێی ٢٠٠٠ کەسی تێدا دەبۆوە. دەرگا گەورەکانی ژوورەکە دادەخرێن. گڵۆپەکان دەکوژێنەوە و دوای ئەوە تۆزی زایکلۆن بی Zyklon B لەگەل دلۆپەی سیانیدی هایدرۆجین بەردەدرێتەوە ناو ژوورەکەوە. پاش هەوا گۆڕینی ژوورەکان، لاشەی کوژراوەکان لەلایەن بەندکراوە جولەکەکانەوە دەبرێنە دەرەوە بەرەو شوێنی سوتاندنیان لە فڕنی ناو بیناکاندا یان لە دەرەوەی هۆلەکان لە هەوای کراوەدا دەسوتێنران. هەموو ئەو پرۆسەیە تەنها سەعاتێك یان دوو سەعاتی دەخایاند.

"پێنج پێنج ریزیان گرتبوو لە شەقامی گەیشتن دەهاتنە خوارێ. ئەمە شەقامی ڕۆیشتنە بەڵام ئەوان نازانن. شەقامێکی یەك سەرییە. زۆر بەڕێکوپێکی بەرێدا دەڕۆن - تا هیچ هەڵەیەك نەکەن. دەگەنە بیناکەو هەناسەیەك هەڵئەکێشن. ئەوا گەیشتنە دوا مەنزڵی خۆیان.

کاتێکیش سەربازەکان فەرمانەکانیان دەدەن و بەسەریاندا دەنەڕێنن تا جلەکانیان داکەنن و لەپێشدا جلی منداڵەکانیان دادەکەنن و بەهێواشی تا لەپڕ خەبەریان نەبێتەوە.

پاش سەفەرێکی درێژ کە چەند شەو و ڕۆژێکی خایاندوە، هەموو ماندو و بێ تاقەتن.

پاشان ژنەکان لەبەرچاوی منداڵەکان خۆیان ڕووت دەکەنەوە، نابێت هیچ بکرێت.

کاتێك هەریەکەیان خاولیەك وەردەگرێت، دەپرسن ئایا ئاوەکە ساردە یان گەرمە، نەك منالەکان سەرمایان بێت.

کاتێکیش پیاوەکان لە دەرگاکەی ترەوە بەڕووتی دێنە ژووری دوشەکانەوە، ژنان بە منداڵەکانیان لەشی خۆیان دادەپۆشن.

چارلۆت دێلبۆ

# ٦٠٠ کوڕەکە

سالمێن لوینتهال، یەکێك بوو لە ئەندامانی (گرووپی ئەرکی گران– Sonderkommando) ئەم گرووپە، بەندکراوەکانیان بوون و ناچار دەکران ئیش لە ژوورەکانی گازدا بکەن. لە ٢٠ی تشرینی یەکەمی ١٩٤٤دا بەچاوی خۆی ئەم ڕوداوەی بینیوە و لەسەر پارچەیەك نوسیویەتەوە و نوسینەکەی لە ساڵی ١٩٦١دا نزیك یەکێك لە فڕنەکان دۆزرایەوە.

بە نوێژی نیوەڕۆ ٦٠٠ لاوی تەمەن ١٢ تا ١٨ ساڵیان هێنا بۆ ئێرە، جلی زۆر تەنك و درێژیان لەبەردا بوو، پێلاوی شڕ و قاپقاپی تەختەیان لەپێدا بوو (..) کاتێك گەیشتنە ساحەکە، سەرکردەکە فەرمانی پێدان کە خۆیان ڕووت بکەنەوە. کوڕەکان ئەو دوکەڵەیان بینی کە لە دوکەڵکێشەکانەوە دەهاتنە دەرێ و یەکسەر هەستیان کرد کە بەرەو مەرگ ڕاپێچ دەکرێن. دەستیان کرد بەغاردان بەدەوری ساحەکەدا و قژی خۆیان ڕادەکێشا و نەیاندەزانی چۆن خۆیان ڕزگاربکەن. زۆربەیان دایانە قوڵپی گریان و قیژە و هاواری نەبیستراویان ئەو ناوەی پڕ کرد بوو.

کوڕەکان لەترسی مەرگ خۆیان ڕووت کردەوە، زۆر لە مەرگ دەترسان. سەریان شۆڕ کرد بوو بۆ ئەوەی لێیان نەدەن جوڵەیان لە خۆیان بڕی. یەکێك لەو کوڕە قارەمانانە چووە بەردەمی سەرکردەکە – کە لەو ناوە ڕاوەستا بوو و داوای لێ کرد کە نەیکوژێت، بەڵێنیدا هەر چی ئیشی گران هەیە بیکات. لە وەڵامدا تێلایەکی کێشا بەسەری کوڕەکەدا. زۆر لەو کوڕانە ڕایان دەکردە لای ئەو جولەکانەی (لەگرووپی ئیشە گرانەکاندا) کاریان دەکرد و خۆیان دەهاویشتە بەردەمیان و خۆیان بەملیاندا هەڵدەواسی و دەپاڕانەوە تا ڕزگاریان بکەن. هێندێکی تر بەلایەکی تردا غاریان دەدا لە ساحە گەورەکەدا دەسوڕانەوە تا خۆیان لە مەرگ ڕزگار بکەن. سەرکردەکە داوای هێزی ئێس.ئێس.ی کرد بۆ یارمەتیدانی.

دەنگی کوڕەکان وردە وردە تیژتر دەبوو و بەرزتر دەبوو تا بووە گریان. ئەو گریان و هاوارە لە دووری چەند میلێکەوە دەبیسترا. ئێمە لە شوێنەکانی خۆماندا سست بووبوین و جوڵەمان لێ بڕابوو لەبەر ئەو هاوار و پاڕانەوانەی ئەو کوڕانە. پیاوانی ئێس.ئێس. بەزەردەخەنەوە سەیریان دەکرد و هیچ گوێیان بەو هاوار و پاڕانەوانە نەدەدا، خۆیان بەسەرکەوتوو دەهاتە پێش چاو و بە لێدان هەموو کوڕەکانیان بردە ژێر زەمینەکەوە. هەتا ئەوساش هێندێك لەو کوڕانە هەر

لەناوساحەکەدا ڕای دەکرد و هەولی خۆ ڕزگارکردنی بوو. پیاوانی ئیس.ئیس. بە هەموو لایەکدا بەشوێنیاندا ڕایان دەکرد، هەتا وەزعەکەیان کۆنترۆل کرد. پاشان هەمویان بردن بۆ ژێرزەمینەکە. زۆر دلیان خۆش بوو!! ئایا خۆیان مندالیان نیە، جەرگیان نیە؟"



ژن و مندال لە سەرەتای ڕێیەکی ١,٥ کیلۆمەتری بەرەو فڕنی ٤ یان ٥، لە ئاوشویز بیرکناو. لە پشتیانەوە چەند واگۆنێکی گواستنەوە دەبینرێت کە لەسەر شۆستەکە وەستاون.

# كاركردن لە دۆزەخدا

(ساوندەر كۆماندۆ) یان گروپی ئەركە گرانەكان، كۆمەڵێك بەندكراوی جولەكە بوون و كە ئەڵمانیەكان ناچاریان كردبوون كە كارە هەرە ناخۆش و پڕ مەترسیەكان ئەنجام بدەن. ئەو گروپانە بەتەواوی لە بەندكراوەكان و دنیای دەرەوە دابڕابوون.

ئیشی ڕۆژانەیان كە هەموو ڕۆژ ئەنجامیان دەدا تا خۆشیان دەكوژران و لە شوێنیان بەندكراوی تریان دادەنا. بریتی بوو لە خاڵی كردنەوەی ژوورەكانی گاز لە لاشەی كوژراوەكان و كردنەوەی دەمی كوژراوەكان و هەڵكێشانی ئەو كیفە ئاڵتونانەی بە ددانیانەوە بوون، بڕینی پرچی ژنە كوژراوەكان، پاشان سوتاندنی لاشەكان لە فرنەكاندا یان لە دەرەوە لەناو چاڵێكدا. یەكێك لەوانە ڕزگاری بوو بوو دەگێڕێتەوەو دەڵێت "زۆر چاك دەمتوانی خۆم بكوژم یان خۆم لەناوبەرم بەڵام ویستم بمێنمەوە تا ببمەشایەت تا تۆڵە بكەمەوەو، بە درندەمان تێ مەگەن ئێمەش وەك ئێوە مرۆڤین، جیاوازیمان ئەوەیە ئێمە لە ئێوە كۆڵترین لە ئێوە دڵ تەنگترین.

(پریمۆ لیڤی) یەكێك بوو لەوانەی لە ئاوشویز ڕزگاری بوو بوو، چەند كتێبێكی دەربارەی تاقی كردنەوەی خۆی نوسیوە، نوسیویەتی "كە بیرۆكە و دامەزراندنی (سۆندەركۆماندۆ - گروپی كارە گرانەكان) یەكێك بوو لە تاوانە هەرە گەورەكانی (سۆشیالیستی نەتەوەیی national Socialism) (..) ئەم پرۆسەیە مانای گواستنەوەی تاوانەكان بۆ لایەنەكەی تر - بەتایبەت بۆ سەرشانی قوربانیەكان - بەم شێوەیەش خۆیان لە تاوانەكە دەربازدەكەن. "لیڤی پێی وایە كە سۆندەر كۆماندۆ لە ڕاستیدا ماناو بیری نازیەت بەرجەستە دەكات كە دەڵێن (ئێمە ڕەگەزی پیرۆز، دەتان شكێنین، دەتان ڕوخێنین، خۆ ئێوە لە ئێمە چاكتر نین، ئێمە گەر بمانەوێت، لە ڕاستیشدا دەمانەوێت، دەتوانین نەك هەر لاشەتان تێكبشكێنین، بەڵكو دەتوانین ڕۆحیشتان خاپوركەین و هەر وەك چۆن ڕۆحی خۆمانمان خاپور كرد). " لیڤی پێی وایە كە ئەوانەی نازیەتیان قبوڵ كرد و ئەوانەش كە كردیان بە ئەستێرەی ڕۆشنكەری ڕێگایان و ئەوانە ڕۆحی خۆیان، ناخی خۆیان خاپور كرد" [٣٦]

"هەموو ڕۆژەکە و هەموو شەوەکە
هەوو ڕۆژێك و هەموو شەوێك
دوکەڵ لە دوکەڵکێشەکان بەرز دەبوەوە و سوتەمەنیشی
لەهەموو ئەوروپاوە بۆ دەهات "
چارلۆت دیلبۆ




کردنەوەی ژوورەکانی گاز. یەکێك لەو چەند وێنەیەی لەلایەن دایڤید ئۆلرەی (سۆندەر کۆماندۆیەکی فەرەنسی)یەوە ڕەسم کراوە. کە ڕزگاری بوو، ئۆلرە ئەم وێنەیەی پاش سالێك دوای جەنگ دروست کردووە.

## ڕاپەڕین لەگیتۆدا

لەگەڵ ئەو ژیانە کولەمەرگیەو ئەو بارودۆخە ناهەموارەشدا و دوو جار ڕاپەڕین لە گیتۆی وارشۆدا بەرپا بوو و ئەمەی خوارەوە باس لە ڕاپەڕینی دوهەم دەکات لە بەهاری ١٩٤٣دا. ئەو وێنەیەی (لاپەڕە ١٥٣) وێنەی دەستگیر کردنی جەنگاوەرە یاخی بووەکانە، هەندێکیان توانیان دەربازبن. (سیمچا ڕۆتێن) دەگێڕێتەوە چۆن توانیویەتی ڕزگاربێت و لە گیتۆکە هەڵێت.

" لە سێ ڕۆژی یەکەمی شەڕدا، جولەکەکان باڵا دەست بوون و ئەڵمانیەکان بەرەو دەروازەی گیتۆکان ڕایان کرد و دەیانیان لێ بریندار بوو. پاش ئەوە، ئەوەی پێیان کراو بۆیان لوا لە دەرەوە کردیان هەر لە بەکارهێنانی هێزی ئاسمانی تا تۆپخانە، ئێمەش نەمانتوانی خۆمان لەبەردەم بۆمبارانی ئاسمانی و ئەو ئاگربارانەی گیتۆکەدا بگرین. گیتۆکە بوو بوو بە پارچەیەك گڕو ئاگر (..) باوەڕ ناکەم هیچ زمانێکی سەر زەوی بتوانێت وەسفی ئەو ترس و نائارامیەی ناو گیتۆکە بکات. لەناو ئەو شەقامانەدا، گەر بتوانرێت پێ یان بوترێت شەقام، چونکە هیچیان بەسەر هیچەوە نەمابوو، ناچار دەبوین بەسەر گردۆڵکەی لاشەی مردووەکاندا سەرکەوین کە بەسەریەکدا کەوتبوون. هیچ شوێنێکمان نەمابوو بۆی بچین، لەگەڵ ئەوەشدا دەبوو شەڕ لەگەڵ ئەڵمانیەکاندا بکەین و دەبوایە خۆشمان لەبەر برسێتی و تینوێتی ڕابگرین.هیچ پەیوەندیەکمان لەگەڵ دنیای دەرەوە نەمابوو. بەتەواوەتی لە دنیای دەرەوە دابڕابوین.

گەیشتینە خاڵێك کە هەستمان کرد کە بەرگری کردن لەوە زیاتر شتێکی بێ مانایە. بیرمان لەوە کردەوە کە بەناو بەشە (ئاری)یەکەی وارشۆدا بڕۆین و لەگیتۆکە بچینە دەرەوە (..)

لەبەرە بەیانێکی زۆر زوودا لەپڕ خۆمان لەناوەڕاستی شەقامێکدا بینیەوە، تێفکرە ئەو بەیانیە خۆرەتاوەی ١ی مایس، کە ئێمە لەسەر ڕاستە شەقامەکە وەستابووین. خۆمان لە ناوەڕاستی خەڵکی سادەدا بینیەوەو ئێمەش لەوە دەچوین کە لە ئەستێرەیەکی ترەوە هاتبین (..)

بەدەوری گیتۆکەدا، هەمیشە جاشی پۆڵەندی هەبوو کە بەدوای جولەکەدا دەگەڕان تا بیانگرن. هەر بە موعجیزە لەدەست ئەوانە ڕزگارمان بوو. لە بەشە (ئاری)یەکەی وارشۆدا ژیان زۆر بە ئارامی هەر وەك جاران بەڕێوە دەچوو. چایخانەکان ئیشی خۆیان دەکرد، چێشتخانەکان کراوە بوون، پاسەکان تراموا‌کان کاریان دەکرد، هەروەها سینەماکانیش کراوەبوون. گیتۆکە دورگەیەکی دابڕاو بوو لەناوەڕاستی ئەو ژیانە ئاساییەدا.

# بەرگری و فریاکەوتن

یەکێك لەو چیرۆکە خەیاڵیانەی بۆ قەتڵ و عام هەڵبەستراوە ئەوەیە گوایە ملیۆنەها جولەکە وەك بەرخ چونە بەردەمی قەساب!. بەڵام لەڕاستیدا سەدان داستانی بەرگری و قارەمانێتی هەن. هەر لە ڕاپەڕینەکەی گیتۆکەی وارشۆوە تا بەشداری جولەکەکان لە پەلامارداني سوپای ئەڵمانی لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای ئەوروپادا هەتا ئەو چالاکیانەی پێیان دەگوترا (بەرگری بەبێ چەك) کە چەندین لە جولەکەکان بەگژ دڕندەیی بکوژەکانیاندا دەچوونەوە کە خاوەنی ئەو هێزە زەبەلاحە بوون. هەتا لەناو ئۆردوگاکانیشدا، بەندکراوە جولەکەکان و ئەوانەی تریش بەرگری و ڕاپەڕینیان ئەنجام داوەو بەگژ جەلادەکانیاندا چونەتەوە. هێندێك لەو هەوڵی دەربازبوونانەش کە دەدران دەچنە قاڵبی بەرگریەوە، بەڵام هەموو ڕاپەڕین و بەرگریەکان، لە لایەن ئەڵمانیەکانەوە بەوپەڕی دڕندەییەوە سەرکوت دەکران. هەر هەوڵێکی ڕاکردن و دەرباز بوونیش دەبوە هۆی سزاداني دڕندانەی بەکۆمەڵی خەڵکەکە.

زۆربەی کاتەکانیش لاوەکان هەوڵی دەربازبوون و بەرگریان دەدا و لە ئاکامیشدا ڕوو بەڕوی دڕندانەترین تۆڵەوسزا دەبونەوە. بەو پێیەش ئەوانە تەنها ژیانی خۆیان نەدەخستە مەترسییەوە بەڵکو ژیانی دایك و باوك و برا و کەسوکار و دراوسێکانیشیان دەکەوتە مەترسییەوە. زۆر لەو کەسانەی بیریان لە دەرباز بوون دەکردەوە دەیانزانی گەر خۆشیان ڕزگاربێن ئەوا هاوڕێ و ئازیزانیان توشی سزا دێن و دەکوژرێن. بۆیە لەناو ئەو ئۆردوگای مەرگانەدا خەڵکەکە دڵنیابوون لەوەی ژیانیان هێندەی نەماوە بەڵام هەرچی سەیریان دەکرد دۆزینەوەی ڕێگایەکی گونجاو بۆ بەرگری کردن گەلێك ئاڵۆز بوو. هەوڵدان بۆ مانەوە یان هیچ نەبێت مردن بەسەربەرزیی و شەرەفمەندی تاکە شت بوو کە بیریان لێ دەکردەوە پێش ئەوەی بڕیار بدەن بەرگری بکەن یان نا.

ئەوەش بەڕونی لەو بانگەوازەی (ڕێکخراوی جەنگاوەرانی جولەکە)دا دەردەکەوێت کە لە وارشۆ لە کانونی دوهەمی ١٩٤٣ بڵاویان کردەوە.

" دەبێت ئەوە بزانین کە ڕزگاربوون مانای ئەوە نیە بەپێی خۆمان بەرەو مەرگ بڕۆین، هەر وەك چۆن مەڕێك بۆ بەردەم قەسابەکە دەبرێت. ڕزگار بوون لە کارێکی مەزنترەوە دێتە دی. ئەگەر چی ئەو کەسەی ڕێی بەرگری دەگرێتە بەر ڕەنگە بتوانێت خۆی ڕزگار بکات - ئەوەش کە

لە سەرەتاوە خۆی بەدەستەوە بدات و واز لە خەبات بێنێت. ئەوا لە سەرەتاوە هەڵوێستی خۆی دەدۆڕێنی! ئەو جۆرە خەڵکە هیچ شتێك چاوەڕێی ناكات غەیری مل شۆڕی و لەناوچوون نەبێت لەنێو ماشێنی مەرگدا لە (ترێبلینکادا) (..) ڕێ بدە با خەڵکی بۆ خەبات و بۆ جەنگ بەئاگابێنەوە! (..) ئێمەش دەمانەوێت بژین! ئێمەش مافی ژیانمان هەیە (..) با لە خەو هەڵسین، خەبات بکەین و بجەنگین بۆ ژیان!"

چەندین گروپی بەرگری بە قەوارەی جیاواز لەو ١٠٠ (گێتۆ)یە لە ڕۆژهەڵاتی ولاتە ئەوروپیەکاندا دروست بوون. چالاکترین گروپ لەوانە (کۆمەڵەی پارتیزانی) بوو کە لە دارستانەکانی ڕۆژهەڵاتی ئەوروپادا دەجەنگان. پتر لە ٢٠,٠٠٠ جولەکە لەو گروپانەدا دەجەنگان، هێندێك لەوانە خێزانەکانیشیان لەگەڵدا بوون.

لە ئەوروپای ڕۆژئاوادا جولەکەکان گەلێك چالاك بوون لە گروپەکانی بەرگری نەتەوەیی لە فەرەنسا و بەلجیکا، زۆر لەو گروپانە جولەکەکانیان حەشاردەدا. توانیان ژمارەیەکی کەمیش لە منداڵانی جولەکە لەنێو کەنیسەکاندا یان لەگەڵ خێزانە مەسیحییەکاندا حەشارگەیان بۆ بدۆزرێتەوە، هەر وەك لە پۆڵەندا و هۆڵەندا و فەرەنسادا. زۆربەی ئەو منداڵانە بە مەسیحی گەورە کران و پاشان ناسنامەی جولەکەشیان لەدەستدا. لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەڵمانیەکان زۆر بەتوندی سزای ئەو کەسانەیان ئەدا کە جولەکەیان دەشاردەوە، بەڵام چەندین کەس لە پۆڵەندادا ئامادەبوون ئەو کارە ئەنجام بدەن، یان بۆ پارە یان هەروەك کارێکی مەبدەئی.

شێوەیەکی تر لەشێوەکانی بەرگری بەقاچاغ دەربازکردنی جولەکەکان بوو لەناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی نازیەکانەوە[٣٧]. ئەمەش کارێکی ئاسان نەبوو و هەتا بۆ ئەو ولاتانەش کە سنوریان بە ئەلمانیاوە بوو وەك سویسرا، چونکە هەمیشە سنورەکانیان داخراو بوو تا ڕێ لە ڕاکردنی جولەکەکان بگیرێت. سویسرا زۆر جار ئەو جولەکانەی دەگێڕایەوە کە بۆ خۆدەرباز کردن بەقاچاغ چوبونە ناو خاکەکەیەوە.

زۆربەی جولەکەکان بەتایبەت ئەوانەی ئەوروپای ڕۆژهەڵات توانیان پاش سەفەرێکی دورو درێژ خۆیان بگەیێننە فەلەستین، هێندێکی تر دورتریش کەوتنەوە. چەند هەزار جولەکەیەك خۆیان گەیاندە (شەنغهای)، چین، یابان کە ئەو شارانەی داگیر کردبووخۆی هاوپەیمانی ئەلمانیا بوو و بەڵام هەمان بیروباوەڕی نازیەکانیان نەبوو.

"هەموو کارێك دەکرا وەك بەرگری سەیری بکرێت، چونکە هەموو شت قەدەغە بوو. هەموو کارێك کە دەری بخستایە کە شتێکی تایبەت بە بەندکراوەکان خۆیانە، ئەوە بەرگری بوو."

ئەنری دیڤۆتۆ
زانایەکی دەروونناسی ئیتاڵی

"پاشان بە ڕوسی وتی: هاوڕێیانم ئەمە خۆشترین ڕۆژی ژیانمە، کاتێك دەبینم ئەو ژمارە زۆرە لە گیتۆ ڕزگاریان بووە!
. . من بەڵێنی هیچتان پێ نادەم، ڕەنگە لەپڕێکدا هەمووومان بکوژرێین کاتێك لە هەوڵی ژیانداین. بەڵام ئەوەی پێمان بکرێت دەیکەین تا زۆرترین کەس لە مەرگ ڕزگارکەین. ئەمە ڕێگای ئێمەیە، ئێمە جیاوازی ناکەین لە نێوان پیر و منداڵ و ژن و پیاودا. ژیان گەلێك گرانە، ئێمەش هەموو کات لە مەترسیداین، بەڵام ئەگەر لەناوچوین و ئەگەر مردین، ئەوا وەك مرۆڤێك دەمرین."

موشی بایراش
یەکێك لە ئەندامانی کامپی خێزانی (بیلیسکی)

هێزەكانی پارتیزان لە دارستاندا



تۆڤیا بیلسكی لاوێكی جولەكەی پۆڵەندی بوو، كە لە سەرەتای داگیركردنی وڵاتەكەیەوە لەلایەن ئەڵمانیاوە، بڕیاری خۆشاردنەوەی داو وردە وردە توانی گروپێك لە برادەرانی بۆ خەبات كردن لەناو دارستانەكانی ڕۆژئاوای (بیلۆڕۆسیا)دا كۆبكاتەوە. بیلسكی بڕیاریدا كە ئەو گروپە نابێت تەنها بەرگری لە خۆی بكات بەڵكو دەبێت فریای جولەكەكانی تریش بكەوێت. ئەو كۆمەڵە جەنگاوەرە پاشان بەناوی (پارتیزانەكانی بیلسكی)یەوە ناوبانگیان پەیداكرد. كاتێكیش لە ساڵی ١٩٤٤دا ئازادی هاتە دی و ئەم گروپە نزیكەی ١٢٠٠ پیاو و ژن و منداڵیان لەلای خۆیان پاراستبوو. بەلای ئەم گروپەوە سیاسەتی یارمەتیدانی جولەكە و ڕزگاركردنیان و هەوڵدان بۆ مانەوەیان، بەلاوە گرنگتر بوو لەكوشتنی چەند ئەڵمانیەك. گروپی تری لەم چەشنە هەبوون، كە توانیبویان خۆیان لەدەست ئەڵمانیەكان دەرباز بكەن و بچنە ناو دارستانەكانی ڕۆژهەڵاتی پۆڵەندا و چەند شوێنێك لە ڕۆژئاوای یەكێتی سۆڤیەتدا.

لەو نوسینەی (لاپەڕە ١٥٨)دا (موشی بارباش) ئەو قسانەی (بیلسكی) دەگێڕێتەوە كە لەكۆبونەوەیەكی ناو دارستاندا بۆ پارتیزانەكانی كردبوو.

## ڕاپەڕینەکەی گیتۆی وارشۆ

پاش ئەوەی لە کۆتاییەکانی هاوینی ١٩٤٢دا ژمارەیەکی زۆری جولەکە پتر لە ٢٠٠ هەزار کەس لە گیتۆی وارشۆوە بە کۆمەڵ بەرەو ترێبلینکا ڕاگوێزران، ئەو جولەکانەی لە گروپەکانی بەرگریدا مابوونەوە بڕیاریاندا دەست بە بەرگری چەکدارانە بکەن. هیچ چارەیەکی تر نەمابوو. کاتێك ئەڵمانیەکان لە ١٨ی کانونی دوهەمی ١٩٤٣دا بە مەبەستی کۆکردنەوەی باقی خەڵکەکە و ڕاگواستنیان چونە ناو گیتۆکەوە و پەلاماردران و تەقەیان لێ کرا. ئەگەر چی ئەڵمانیەکان توانیان نزیکەی ٦٠٠٠ جولەکە کۆبکەنەوە ڕایانگوێزن و بەڵام پاشان لە گیتۆکە پاشەکشەیان کرد و تا ماوەی چەند مانگێك نەیانتوانی بچنەوە ناو گیتۆکە. لەکاتی ئەو ئاگربەستەشدا جولەکەکان هەوڵیاندا کە خەڵکی تر لە دەوری خۆیان کۆبکەنەوە بۆ ئەو جەنگەی لە پێشیان بوو خۆیان سازبدەن. لەو ماوەیەدا توانیان چەك و تەقەمەنی و نزیکەی سەد ١٠٠ دەمانچە و ڕەشاشێك و چەند نارنجۆکێك و بۆمبی سادە پەیدا بکەن. بۆ خۆئامادەکردن بۆ ئەو بەرەنگاربونەوەیەش ٨٠٠ پیاو و ژن خۆیان بۆ ئەو جەنگە ئامادە کرد و سەنگەر و مەتەریز و شوێنی خۆحەشاردانیان ئامادەکرد. شەڕی کۆتایی لە ١٩ی نیساندا بەرپا بوو، کاتێك ئەڵمانیەکان ویستیان بچنەوە ناو گیتۆکە. لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەڵمانیەکان تانکیان بەکاردەهێنا بۆ چونە پێشەوە بەڵام جەماوەری بەرگریکەر پاشەکشەیان پێکردن. ئەو بەرگریە بەهێزە وای لە ئەڵمانیەکان کرد کە تاکتیکی شەڕەکە بگۆڕن و کەوتنە بەکارهێنانی تۆپخانە و هێزی ئاسمانی. لە ڕۆژی شەشەمی ئەو ڕاپەڕینەدا (مۆردەخای ئانیلوسز) کە یەکێك لەسەرکردەکانی ڕاپەڕینەکە بوو، نوسیویەتی: "شتێك لای هەموو لایەکمان ڕوون بوو، ئەویش ئەوەیە کە قارەمانێتی و ئازایەتی بەرگریکەران زۆر لەوە زیاتر بوو کە چاوەڕێی بووین و دوو جار ئەڵمانیەکانمان تێکشکاند (. . ) قوربانیەکانیشمان زۆر کەم بوون."

بەڵام هێزی ئەڵمانیەکان پەرەی دەسەند، گەڕەك بە گەڕەك ئاگریان لەماڵەکانی ناو گیتۆکە بەردا و بەو شێوەیەش ئەو خەڵکەی خۆیان حەشار دابوو ناچارکران بێنەدەرێ، زۆربەیان کوژران یان دەستگیرکران. ڕاپەڕینی گیتۆکە چوارهەفتە درێژەی کێشا. یەکێك لەو جەنگاوەرانەی ڕزگاری بوو نوسیویەتی: "ئێمە چەند جارێك تێکمان شکاندن و ئەمەش وای لێ کردین مەرگمان لا ئاسانتر بێت و چارەنوسمان هێندە گران نەبێت"

## گۆرانی (Sog nit kejnmol)




هەرگیز مەڵێ ئەمە دوا ڕێیە پیای دەڕۆم
گەرچی ئاسمان ڕەش وتاریك، هەوربەری سامالی شینی گرتوە
ئەو ڕۆژەی هەموو بەهیواین هەر دێتەدی
هەنگاوەکانمان دەنگ دەداتەوە: ئێمە لێرەین!

هێرش گلیك (١٩٢٠-١٩٤٣) لە گێتۆی (ڤلنوس) لە ساڵی ١٩٤٣دا پەیوەندی بە پارتیزانەکانەوە دەکات، ڕاپەڕینەکەی گێتۆی وارشۆ ئیلهامی نوسینی بوە. گۆرانی (Sog nit kejnmol) لەلایەن هێرشەوە نوسراوەو ئەم گۆرانیە لەپاشاندا بە گۆرانی پارتیزانەکانی جولەکە ناوبانگی دەرچوە.

"سـەعات چـواری تـەواوی دوای نیـوەڕۆ، بانگـەواز بـۆ گروپەکان دەنێردرێت و فەرمانیان پێ دەدرێت تا بە پەلەبێن بۆ گەراجەکـە بـۆ وەرگرتـنی چـەك. (ڕۆداك) لێپرسـراوی دابەشکردنەکەیە. هەر کەسێك دێت بۆ چەك وەرگرتن پێویستە وشە نهێنییەکەی لێ داوا بکرێت: مەرگ!، وەڵامەکەشی ژیان! دەبێت: مەرگ - ژیان، مـەرگ - ژیـان، وشـەکان بـەخێرایی دوبـارە دەکرێنـەوە و لەگەڵیدا دەسـتدرێژ دەکرێـت بـۆ وەرگرتـنی چەکەکە، دەمانچە، تفەنگ یان نـارنجۆکێك. لـە هـەمان کاتدا هێرش دەکرێتە سەر سەرکردەی تاوانکاران لە ئۆردوگاکەدا (..) کاپتن زیلمۆر بە تەورێکەوە پەلاماری دوو سەربازی ئێس.ئێس. دەدات و خـۆی دەگەیێنێتـە لای ئێمـە و سـەرکردایەتی دەگرێتـە دەسـت. لـە تەنیشـت گەراجەکـەوە. زرێپۆشـێکی ئـەڵمانی وەسـتاوە، کـە ماوەیـەك پێـش ئێسـتا (ڕوداك) توانیویـەتی مەکینەکەی لەکار بخات، ئێستا ئەو زرێپۆشە بەکەڵکی خۆی دێت وەك سـەنگەرێك بـەکاری دێنێـت و لـەوێوە تەقـە لـە ئەڵمانیـەکان دەکات. فیشـەکەکانی (سـترۆمفۆهەر کـۆرد میێـدلار)و چـەند سەگێکی تری هیتلەر دەپێکێت. گروپەکەی (سدۆڤیدچ) توانیان دەست بگرن بەسـەر عـەمباری تەقەمەنیەکەدا، چـەك بەسـەر هاوڕێکـاندا دابـەش دەکرێـت و ئێسـتا دوو سـەد هاوڕێمـان چەکدارن. باقی خەڵکەکە بە تەور و پاچ و خاکەنازەوە پەلاماری ئەڵمانیەکان دەدەن (..) زۆربەی برادەرانمان کوژران، بەڵام لـە ئەڵمانیـەکانیش دەکـوژرا.. چـەند کەسـێکمان بـە سـەلامەتی ماینەوە"

ستیەنسلۆ کۆن
یەکێك لە بەشدارانی ڕاپەڕینی تریبلینکا، کە ڕزگاری بوو بوو

## ڕاپەڕینی ئۆردوگای مەرگ

لە هەموو هەوڵەکانی بەرگری و ڕاپەڕینەکاندا ، ئەو سێ بەرەنگارییەی لە ئۆردوگاکانی مەرگدا بەرپا بوون لە هەموویان قارەمانانەتر بەڵام لە هەمووشیان بێ هیواتر بوون. بەندکراوە جولەکەکان لایان ڕوون بوو کە بەرەو مەرگ ڕاپێچ دەکرێن و ئەو مردنەش لە هەر ساتێکدا بێت دەگاتە سەریان. هەموو دەربازبونێکی سەرکەوتووش بەدواگەڕانێکی زۆری بەدوادا دەهات (واتە ئەڵمانیەکان زۆر بەفراوانی هەوڵی گرتنەوەی ڕاکردوەکەیان دەدا -وەرگێڕ) ، لەگەڵ ئەوەشدا ڕاپەڕین لە مانگی ئابی ١٩٤٣دا لە ئۆردوگای ترێبلینکا و لە تشرینی یەکەمدا لە سۆبیبۆر و لە پاش ساڵێك لە تشرینی یەکەمی ١٩٤٤دا لە ئاوشوێز -بیرکناودا ڕاپەڕین ڕویاندا. ڕاپەڕینەکەی ترێبلینکا لەپاش نیوەڕۆی ڕۆژی ٢ی ئابدا هەڵگیرسا. دوای ئەوەی چەند بەندکراوێك چەکیان پێ بوو و باقی خەڵکەکە بە تەور و پاچ و خاکەنازە و بەدەستی بەتاڵەوە پەلاماری پاسەوانەکانیاندا. بیناکانی ئۆردوگاکە هەموویان ئاگریان تێ بەردراو لە ئاکامدا نزیکەی ٧٠٠ بەندکراو توانیان دەرباز ببن، زۆربەی هەرە زۆریان پاش ماوەیەکی کەم گیرانەوە و یەکسەر کوژران. کەمتر لە سەدکەس ١٠٠ توانیان پاش ئەو ڕاپەڕینە دەرباز بن و بۆ دوای جەنگ بمێننەوە. دوو هەفتە دوای ئەوە ژوورەکانی گاز بە بەردەوامی کاریان دەکرد.

ڕاپەڕینەکەی سۆبیبۆر لە ١٤ی تشرینی یەکەمدا هەڵگیرسا و پیلانی باشتری بۆ داڕێژرابوو. زۆر لە ئەفسەرانی ئێس.ئێس. و (ئۆکراینی) یە هاوکارەکانیان کوژران. لەو ٥٥٠ بەندکراوەی ئەو ڕۆژە لە ئۆردوگاکەدا بوون نزیکەی ٣٢٠ کەسیان دەربازیان بوو بەڵام هەر زوو ١٧٠ کەسیان لێ گیرایەوە و کوژران. لەوانەی کە دەربازبوون ٥٠ جولەکەیان تا پاش جەنگیش مانەوە. ئەو ئۆردوگایە جارێکی تر بەکارنەهێنرایەوە.

لەپایزی ١٩٤٤دا ، کۆمەڵکوژی لە بیرکناو کەمی کردبوو، بەو پێیەش ئەندامانی (سۆندەرکۆماندۆ - ئەرکە گرانەکان) دەیانزانی کە هێندەیان لە ژیاندا نەماوە و ئەوانیش دەکوژرێن. لە ٧ی تشرینی یەکەمدا فڕنی ژمارە ٤ یان تەقاندەوە بە هۆی ئەو تەقەمەنیانەی بەقاچاغ لەلایەن چەند ژنێکی بەندکراوەوە هاتبوە ناوەوە، ئەوەندەی زانیاری لەبەردەستدا بێت هیچ کەس لەو ڕاپەڕینە ڕزگاری نەبوو. هەر پاش ئەوە هیملەری سەرکردەی ئێس.ئێس. فەرمانیدا کە باقی فڕنەکان هەڵوەشێنن و بیانڕوخێنن.

## بەرگری مەدەنیە ئەڵمانیەکان

ئەگەرچی ئەڵمانیای نازی دەوڵەتێکی تۆتالیتاری (عەسکەری) بوو و بەڵام خەڵکی ئەڵمانیا بە چەند شێوەیەك بەرگریان دەکرد، هێندێك جۆری بەرگری ناڕاستەوخۆ بوو بەوەی خەڵکانێك هاوکاری ئەو تاوانانەی ڕژێمیان نەدەکرد. ئەمانە سزا نەدەدران. تەنها ئەو کەسانەی ڕاستەوخۆ بەشداری چالاکی بەرگریان بکردایە دەکەوتنە بەر شالاوی جستاپۆ، کە لەڕاستیدا جستاپۆ هاوکاریەکی چالاکانە دەکرا لەلایەن دەیان هەزار ئەڵمانیەوە و ئەمەش یارمەتی دەدان تا بتوانن تیرۆرو تاوانەکانیان بەو شێوە بەرفراوانە ئەنجام بدەن. بەبێ هاوکاری ئەو خەڵکە جستاپۆ سەرکەوتنی بەدەست نەدەهێنا.

ئایا گەلی ئەڵمانیا تا چ ڕادەیەك ئاگاداری تاوانەکانی نازیەکان بوون دژی جولەکە تا ئێستا تەواو ڕوون نیە و مشتومڕێکی زۆری لەسەرە[38] بەڵام زانیاریە گشتیەکان لەناو خەڵکدا شاراوە نەبوو هەموو لایەك دەیزانی و بەڵام ژمارەیەکی کەم ناڕەزاییان دەربڕی. شایەتەکانی (یەهووا) یەکێك بوون لەو گروپانەی بەئاشکرا هاوکاری ڕژێمیان ڕەت کردەوەو ئەمەش بوە هۆی ئەوەی زۆر بە خراپی سزا بدرێن. ڕازی نەبوون سوێندی وەفاداری بۆ هیتلەرو ئەڵمانیای نازی بخۆن. ئەگەر چی ئەو بەرگریەیان مایەی پێزانینە، چونکە ئیمزاکردنی پارچە کاغەزێك بەس بوو بۆ ئەوەی لە مردن ڕزگاریان بێت. بەڵام زۆر کەمیان ئەو ئیمزایەی کرد. هەزاران کەس لە (شایەتەکانی یەهووا) کە خۆیان ۲۰,۰۰۰ کەسێك دەبوون بەرەو ئۆردوگاکانی مەرگ ڕاپێچکران، نزیکەی ۲۵٪ ئەندامانی ئەو گروپە لەلایەن نازیەکانەوە کوژران.

هێندێك لە لاوانی ئەڵمانیا بەرگریان کرد لەوەی بەزۆر بخزێنرێنە نێو (لاوانی هیتلەر)ەوە، دژی ڕژێم خۆپیشاندانیان ئەنجامدا. لەوانە گروپی ڕێکخراوی (ئیدل وایز پیرەیتز) و (سوێنگ کیدز) کە خۆپیشاندانیان دژی ڕژێم ئەنجام دەدا (بەوەی گوێیان لە مۆسیقای جازی ئەمەریکی دەگرت و لەسەر ئاوازەکەی سەمایان دەکرد). لەسەرەتادا نازیەکان نەیاندەزانی چۆن مامەڵە لەگەڵ ئەو گروپانەدا بکەن. لەگەڵ ئەوەشدا چەندین جار شەڕ و پێکدادان لە نێوان (لاوانی هیتلەر) و ئەندامانی ئەو ڕێکخراوانەدا دەقەوما پاشان لە پایزی ۱۹٤٤دا ڕژێم پەلاماری چەند ڕێکخراوێکی داو و زۆربەی سەرکردەکانیان گیران و ئیعدام کران.

ڕێکخراوی (گوڵە سپییەکە)ی شاری میونخ بزوتنەوەیەکی چالاك بوو بەتایبەت لە نێوان ٢٢ی حوزەیرانی ١٩٤٢ و شوباتی ١٩٤٣دا. ئەم گروپە نارەزا بچکۆلەیە لەلایەن جووتە خوشك (سۆفیا و هانز شولی)ەوە دامەزرا و پرۆفیسۆر (کۆرد هۆبەر) لە زانکۆ هاوکاری دەکردن. چەند بەیانێکیان بڵاوکردەوە تیایدا داوایان لە خوێندکارانی هاوڕێیان دەکرد تا دەنگی نارەزایی دژی نازیەکان و ئەو کوشتارەی جولەکە بەرز بکەنەوە. لەلایەن جستاپۆوە گیران. دادگایی کران و ئیعدام کران. یەکێك لە ئەندامانیان (ئەلیکساندەر شمۆرل) لە دوا نامەیدا نوسیویەتی: "ئێمە لەگەل (هانزدا) دژی رژێمی نازی خەباتمان کرد و پاشان خیانەتمان لێ کراو حوکمی ئیعدام دراین."



بزوتنەوەی بەرگری لاوەکان (یاخی بوەکان یان (چەتە دەریاییەکانی ئیدل وایز)
دژی ڕێکخراوی (لاوانی هیتلەر) خەباتیان دەکرد.

زۆربەی هەرە زۆریان گیران و لە تشرینی دوهەمی ١٩٤٤دا لە شاری کۆلگن
ئیعدام کران. ئەمەی خوارەوە یەکێك لە گۆرانیەکانیانە:

هێزی هیتلەر ڕەنگە بماندا بە ئەرزا
بەزنجیر پێوەند بکرێین
بەڵام ڕۆژێك ئەو کۆتانە دەپسێنین
(..)
(لاوانی هیتلەر) دەبەزێنین
ئێمە گۆرانی بۆئازادی، بۆ خۆشەویستی و بۆ ژیان دەچڕین
ئێمەین (یاخی بوەکانی ئیدلوایز)

# ناڕەزایی دەربڕینەکەی ڕۆزن شتراسە

یەکێك لەو ناڕەزایی دەربڕینە دیارانەی دژی نازیەکان کرا ئەو خۆپیشاندانە ئاشکرایەی لە شەقامەکانی شاری بەرلیندا لە ئازاری ١٩٤٣ دا ڕوویدا.لەماوەی جەنگدا ڕژێم دوو دڵ بوو لە ڕاگواستنی ئەو پیاوە جولەکانەی ژنی غەیری جولەکەیان مارە کردبوو و ترسی ئەوەی هەبوو خۆپیشاندان لەدژی ئەو کارە سازبکرێت. بەڵام بوونی ئەو ژمارە زۆرەی جولەکە لەشاری بەرلیندا بوە مایەی نیگەرانی (جۆزیف گۆبلز)ی وەزیری پڕوپاگەندەی نازیەکان و کە پاشان فەرمانیدا ئەو جولەکانەی بەرلین بگیرێن و ڕاگوێزرێن.

پاش ماوەیەکی کەم دەرکەوت کە ترسەکەی نازیەکان لە جێی خۆیدابوە، چونکە ژنەکان ڕازی نەبوون لە مێردەکانیان جوێ ببنەوەو ئەو ژنانە بەرەنگاری ئەمری جستاپۆ و ئیس.ئیس. بونەوەو هەزارانیان لەناو شەقامەکانی شاردا و لەبەردەم ئەو بینایانەی پیاوەکانی لێ دەست بەسەرکرابوو دەستیان بە خۆپیشاندان کرد. یەکێك لەو خۆپیشاندەرانە (چارلۆت ئیسرائیل) بوو کە مێردەکەی لە ژوورەوە حجز کرابوو. پاشان دەیگێڕێتەوە کەچی ڕوویدا ژنان بەسەر پاسەوانەکاندا دەیانقیژاند "ئێوە ئەی پیاوکوژان" "ئێمە بۆ تەنها جارێك هاوار ناکەین بەلکو دەڵێینەوەو دەیڵێینەوە، تا هەناسەمان لێ دەبڕی" خۆپیشاندانەکە سەری گرت و زۆربەی ژنەکان مێردەکانیان گەڕایەوە لایان. زۆربەی ئەو جولەکە کەمانەی ئەلمانیا کە ڕزگاریان بوو و پاش جەنگ مانەوە، ژنەکانیان جولەکە نەبوون.



دوو مندالی جولەکەی ئەلمانی کاتێك لە سالی ١٩٣٨دا گەیشتونەتە ئینگلتەرا، ئەو منداڵانە بەتەنیا بوون، چونکە وەرگرتنی ڤیزە بۆ هەموو خێزانەکە بۆ شوێنێکی ئارام زۆر زەحمەت بوو. زۆر لە ژن و مێردەکان قورسترین و ناخۆشترین بڕیاریاندا کاتێك منداله‌کانیان بەتەنیا ڕەوانەی وڵاتانی تر کرد، تا ڕزگاریان ببێت.

پاش ئەو کارەساتەی (شەوێکی کریستالی) هێندێك وڵات ڕێ و شوێنی ڤیزە پێدانی بۆ جولەکەکان ئاسان کرد بوو بەتایبەت منداڵان تا ڕزگاریان ببێت. پاش جەنگ زۆر کەم لەو مندالانە بەدایك و باوکیان شاد بوونەوە.

## سوید بەرگری دەکات

ئەگەرچی نازیەکان لە هەوڵی ئەوەدا بوون کە هەرچی جولەکە هەیە لەناویان ببەن "هەموو ئەو جولەکانەی کە دەستیان دەیگاتێ" هێندێك تەگەرە لەو بارەیەوە دەهاتە بەردەمیان و توانای کەم دەکردنەوە. یەکێك لەو تەگەرانە ئەوەبوو کە هێندێك لە جولەکەکان هاونیشتمانی ئەو وڵاتانە بوون کەئەڵمانیا پێویستی بەهاوکاریان هەبوو یان لەگەڵ ئەڵمانیادا هاوپەیمان بوون و ئەڵمانیا پێی باش بوو پەیوەندی بەتینی لەگەڵیاندا هەبێت، ئەم مەسەلەیە هاوپەیمانەکانی ئەڵمانیا و وڵاتە بێ لایەنەکانی ئەوروپای دەگرتەوە، بۆ نمونە سوید.

پاش جێبەجێ کردنی "چارەسەری کۆتایی کێشەی جولەکە" لە کۆتایی ١٩٤٢دا نەرویجی و سویدیەکان پێیان وابوو کە بەخشینی رەگەزنامەی سویدی دەبێتە هۆی پاراستنی بەشێك لەو جولەکانەی ئەڵمانیا. لە ڕاستیدا ئەم پرۆسەیە زۆر لەو جولەکە غەیرە سویدیانە سودیان لێ وەرگرت.

لە ١٩٤٢ بەدواوە، دیبلۆماتە سویدیەکان لە وتووێژی رۆژانەدا بوون لەگەڵ بەرپرسە ئەڵمانیەکان لە ئۆسلۆ و بەرلین و فیشی و کۆبنهاگن، بودابیست بەمەبەستی پاراستنی جولەکەکان لە ڕاگواستن بەهۆی شەمەندەفەرەکانەوە. بەرپرسە سویدیەکان بۆ ئەڵمانیەکانیان ڕوون کردەوە کە سوید مەبەستێکی سیاسی لەو هەڵسوکەوتەی لەگەڵ جولەکەدا هەیە. لەبەرئەوەی ئەڵمانیا پەیوەندی توند و تۆڵی لەگەڵ سویددا هەبوو و هەر بۆیە ئەو بیانو هێنانەوەی سوید تا ڕادەیەك سەرکەوتنی بەدەست هێنا.

بەتایبەت لە بودابیستدا دبلۆماتە سویدیەکانی وەك (ئیڤان دینەلسۆن، پێر ئانگەر، لارش بێری، لە هەمویان ناسراوتر رائول والنبێری) لە ساڵی ١٩٤٤دا، بێ لایەنی خۆیان و وڵاتەکەیان بەکارهێنا بۆ پاراستنی جولەکەکان، بە چەند ڕێگەیەکی جیاوازدا ٢٠,٠٠٠-٣٠,٠٠٠ جولەکە ڕزگار کرا. هەمان شێوازە لەلایەن کەسانی وەك (چارلس لوتز لە سویسرا و ئەنگلۆ رۆتۆ لە ڤاتیکان) بەکارهات.



دیبلۆماتی سویدی ڕائۆل والنبێری لەسەر مێزەکەی خۆی لە بودابیست.

بەگەیشتنی ئەو بۆ ئەوشارە لە سالّی ١٩٤٤دا دەستەی دبلۆماتی ولاّتەکەی گوڕێکی بەتینی تێ هات بۆ یارمەتیدانی جولەکەکان. دکتۆر.ل. پۆرزۆلّت پاش ئەوەی پێیان ڕاگەیاند کە دایك و باوکی لەلایەن سویدەوە هاوکاری کراون لە ئۆپسالاوە لە ٢٥ی مایسدا ئەمەی خوارەوەی بۆ مەکتەبی وەزارەتی دەرەوەی سویدی نوسیوە و دەلێت:

"ڕێم بدەن تا سوپاسێکی بێ پایانی خۆم بە شانشینی سوید و دەستەی دبلۆماسی ولاّتەکەتان بکەم لە بودابیست بۆ ئەو هیممەت و هەولە بەپەلەیەیان. پەیامی پاراستنی ئەو خەلکە هەموو کات ڕۆلّی خۆی دەبینێ ئەویش ئارام کردنەوەو پاراستن و یارمەتیدانی شەرەفمەندانەی دایك و باوکم. بۆ ئەو کەسانەی کە خۆیان لەو بارودۆخەدا دەبیننەوە و چاویان لێیە کە دەولەتێکی ئەوروپی پشت و پەنایانە و هێندە مانایەکی بەرزی هەیە کە هیچی لە مانای ژیان خۆی کەمتر نیە.

ڕائۆل والنبێری لەلایەن سوپای سوری سۆڤیەتەوە لە کانونی دوهەمی ١٩٤٥دا دەستگیر کرا و جارێکی تر چاوی بە سوید نەکەوتەوە. هەتا ئێستاش چارەنوسی نەزانراوە.

تاوان و نازیەت یەك شتن. . بەڵام دەكرێت
ئێمە بەبێ لۆمە دەرباز بین، کاتێك توانامان هەبوو
تا شتێك بکەین بۆ ڕزگارکردنی ئەو قوربانیانە، نەمانکرد
چەند هەنگاوێکی پێویست و
خێرا بنێین؟. . ئەگەر حکومەتەکانی بەریتانیا و ئەمەریکا
بیانویستایە بە بەرنامە بیانویستایە شتێك بۆ ڕزگارکردنی
ئەو خەڵکە بکەن
بەرنامەیەك لەئاست ئەو پێویستیە گەورەیەدا بوایە
ئەیانتوانی بیکەن.

جۆرج بێل
قەشەی چیچیستەر ١٨ی مارسی ١٩٤٣

## تەماشاکەران

لە مێژوی قەتڵ و عامدا ئەکتەرەکان دەکرێن بە سێ بەشەوە یان بە سێ کۆمەڵە خەڵکەوە: ئەنجامدەرانی واتە بکوژەکان، قوربانیەکان لەگەڵ تەماشاکەران واتە ئەوانەی بێ لایەن بوون. ئەو بڕیارەی لەلایەن کۆمەڵەی سێهەمەوە درا بوو گەر بەچاوی ئەخلاق و ویژدانەوە تێی بڕوانین ئەوا لە هەمویان ئاڵۆزتر بوو.

گەلێك زەحمەتە بەرپرسێتی (مسئولیە) کارێك دیاری بکرێت کە نەڕوی دابێ یان زانیاریەك کە وەکو دەڵێن ئاگایان لێی نەبوبێ.

هێندێك لە ڕەخنەگرەکان وای دادەنێن کە تەماشاکردن بەبێ هیچ هەڵوێستێك وەکو بەشداری کردن وایە لە تاوانەکەدا. بەڵام بڕیارێکی لەو چەشنە پێویستی بە بیرکردنەوەیەکی زۆر هەیە پێش ئەوەی بڕیاری لەسەر بدرێت.

زۆربەی ئەو تەماشاکەرانە، دیموکراتیەکانی ڕۆژئاوابوون، چونکە چەندین پاڕانەوەو داواکاریان لەکاتی جەنگدا پێگەیشت کە داوای لێ دەکردن فریای جولەکەکان بکەون. بەڵام ئایا ئەم تەماشاکەرانە لێپرسراوێتی فریاکەوتنی ئەو جولەکانەیان دەکەوێتە سەرشان کە خەڵکی ولاتێکی تربوون؟ وەڵامی ئەو پرسیارە زۆر ئاڵۆزە بەتایبەت لە ساڵانی چلەکاندا، کە چەندین بۆچوون و دەنگی جیاواز بەرز بوونەوە. یەکێتی سۆڤیەت شەڕی مان ونەمانی خۆی دەکرد، دەیتوانی تەنها تۆزێك هاوکاری و یارمەتی پێشکەش بکات. بەڵام لە کاتی جەنگدا لەو ولاتەدا هیچ جیاکاریەك دژی جولەکەی ولاتەکەی یان جولەکەکانی ولاتانی دراوسێ نەدەکرا.

هەڵوێستی (ڤاتیکان) زۆر جار ڕاڕاو لەق بوو و هەڵوێستی نوێنەرەکەی هەمیشە لە گۆڕاندا بوو. زۆر لە قەشەکان یارمەتی شاردنەوەی منداڵانی جولەکەیان دەدا. بەڵام هێندێکیشیان پاش جەنگ هاوکاری و یارمەتی دەربازبوونی نازیەکانیان دا تا لە ئەوروپا هەڵێن. ڕۆڵی پاپا پیەس ١٢ سەرچاوەی ڕاڕایی بوو. لەکاتێکدا (ئەنگلۆ ڕۆتا)ی نوێنەری پاپا لە بوداپێست یارمەتی هەزارەها جولەکەی دەدا، لە هەمان کاتدا (جۆزیف تیسۆ)ی قەشەی سلۆڤاکیا سەرپەرشتی ڕاگواستنی دەیان هەزار جولەکەی هاوولاتی خۆی دەکرد تا بەرەو ژوورەکانی گاز لە ئاوشوێز ڕاپێچ بکرێن. ئەم هەڵوێستە جیاوازانە کارێکی وای کردوە حوکم دان یان دوا بڕیار گەلێك زەحمەت بێت. هەر بۆیە هەڵسەنگاندنی تەماشاکەران یان بێ لایەنەکان هەر بە ئاڵۆزی دەمێنێتەوە.

"خەڵکی دەوڵەتی ڕایخ، وا دیارە ئاگاداری زۆر شت بوون (بۆ نمونە دەربارەی کوژرانی ئەو هاووڵاتیە ئەڵمانیایەکانیان) یان ئاگاداریەکی کەمی (بۆ نموونە کوژرانی جولەکەکانی هاونیشتمانی خۆیان بوون) چونکە دەیانویست هەر ئەوەندە بزانن.

ئەوەی نەیاندەزانی، خۆیان نەیاندەویست بیزانن، لەبەر ئەو هۆیەی سەرەوە. بەڵام خۆ گێل کردن (هەوڵدان بۆ نەزانینی شتێك) هەموو کات مانای ئەوە دەبەخشێت کە لە زۆر زانیەوەیە کە نایەوێت ئاگاداربێت یان زیاتر بزانێت."

ج.پ.ستێرن
مێژوونوسێکی ئینگلیز و یەکێك لە شایەتەکان



هەر کە سوپای هاوپەیمانان ئۆردوگاکانی ناو ئەلمانیایان ئازاد کرد (سوپای سۆڤیەت ئۆردوگای کەرگی لە رۆژهەڵات ئازاد کرد) سەربازەکان واقیان وڕما لەو کارەساتەی چاویان پێ کەوت، هەر بۆیە بە زۆر خەلکی ناوچەکانیان ناچار دەکرد تا ئەو هەزاران لاشەیە بشارنەوە.

لەو وێنەیەدا خەلکی ئەلمانیا لە نورمبیرگ لە ژێر پاسەوانی سەربازە ئەمریکایەکاندا پاشماوەی بەندکراوەکانی ئۆردوگایەك بەناو شاردا دەبەن تا بیانێژن.

"من لە دایك و باوکمەوە فێربووم (کە هەردوکیان لایەنگری حیزبی نەتەوەیی ئەڵمانیا بوون) کە مرۆڤ دەتوانێت بیری دژە سامی لەمێشکدا بێت بەبێ ئەوەی ئەو بیروڕایە تەئسیر لە پەیوەندی ئەو کەسە بە جولەکەکانی هاوڕێیەوە بکات. ڕەنگە بوترێت ئەم هەڵوێستە جۆرێك لێ خۆش بوونی تێدایە، بەڵام لەڕاستیدا پێویستە لۆمەی ئەم هەڵوێست تێکەڵاو کردنە بکرێت، چونکە لە ئەنجامدا من خۆم هەموو هاوکارییەکی سیاسی و ڕۆحی ڕژێمێك و سستەمێکی دژە مرۆڤم کرد، بەبێ ئەوەی یەك تۆز شکم هەبێت لە پاکی و بێ گەردی ئەو کارەی ئەنجامی دەدەم. کاتێك بەباوەڕی خۆمان هەموو ئەو نەهامەتی و ناخۆشییەی بەسەر وڵاتماندا دەهات تەنها جولەکەمان تێدا خەتابار دەکرد و پێمان وابوو، جولەکە پیسن بەدفەڕن خوێنیان پیسە. هەرگیز لەو کاتانەدا بیرم لە ئێوە یان لە (هێر لێوی و ڕۆزڵ کۆهین)ی پیرەمێرد نەدەکردەوە. من تەنها بیرم بۆ ئەوە دەچوو بۆ ئەو پیاوە ترسناکەی لە خەیاڵمدا بوو کە (جولەکە)بوو.

کاتێك بیستم کە جولەکەکان ڕاگوێز دەکرێن و لەسەر موڵك و ماڵی خۆیان دەردەکرێن و لە گیتۆکاندا بەند دەکرێن. یەکسەر ئەو فکرەیەم پەسند کرد و لە مێشکمدا چەسپی، هەرگیز بە بیرمدا نەدەهات کە ئەو چارەنوسە و ئەو نەهامەتیە توشی ئێوە یان (لێوی) پیرەمێردیش دێت. پێم وابوو تەنها جولەکە ڕاودەنرێن و دەردەکرێن."

میلیتا ماشمان

یەکێك لە سەرکردەکانی کچانی ئەڵمانیا، لە تەمەنی ١٤-١٨ ساڵی ئەندامی ڕێکخراوی (لاوانی هیتلەر) بوە.




ڤێنا، سالی ١٩٣٨ لاوێکی جولەکە بەمەبەستی گاڵتە پێ کردنی ناچاری دەکەن سەر دیواری مالی جولەکەیەکی تر بنوسێت، یەکێك لە ئەندامانی حیزبی نازی ئەو گەڕەکە چاودێری دەکات.

## شایەتەکانی جینۆساید

هەر لە یەکەم ڕۆژەکانی داگیرکردنی پۆڵەندا لەلایەن ئەڵمانەکانەوە، توندوتیژی و دڵ ڕەقی و دڕندەیی بوە یاسای ڕۆژانە. ئەو زەرەرمەندییتییە بەهۆی نازیەکانەوە توشی گەلی پۆڵەندی بوو گەلێك قەبە و زۆر بوو، هەتا ئەمڕۆش ئاسەواری ئەو زیانانە هەر ماون. لە هەمووی خراپتر پۆڵەندییەکان ناچار کران تا ڕاستەوخۆ ببنە شایەت و ئاگاداری ئەو هەموو تاوانکاریە، هەموو ڕۆژانێك جینۆسایدی جولەکەکان و بەکۆمەڵکوژیان لەبەرچاویانەوە ڕووی دەدا. ژمارەیەکی زۆر کەم لە پۆڵەندیەکان بەشداری ئەو قەتڵ و عامە بوون بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆر کەس لە پۆڵەندیەکان خەبەریان لەو جولەکانە دەدا کە خۆیان شاردبۆوە، یان پارەیان لەو کەسانە وەردەگرت کە خێزانەکانیان بۆ حەشار دەدان. لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا هەزارەها کەس لە پۆڵەندییەکان خۆی دەخستە مەترسی مەرگەوە لە پێناو هاوکاری و یارمەتیدانی جولەکەکانی هاوڕێیان یان دراوسێکانیان، مەترسییەك کە نەك هەر ژیانی خۆیان بەڵکو هی خێزانەکانیشیانی دەخستە مەترسییەوە. بەرگری نەتەوەی پۆڵۆنی ڕێکخراوێکیان پێکهێنا بوو بەناوی (زێگۆتا)، کە تەنها ئەرکی ئەوە بوو جولەکەکان ڕزگار بکات.

دەتوانین بڵێین لەپێش جەنگیشدا، پەیوەندی نێوان جولەکەکان و پۆڵەندییەکان لە حالەتێکی باشدا نەبوو بەچاوی بێ بڕوایی و دوژمنکارانەوە هەردوولا سەیری یەکتریان دەکرد. جولەکە پۆڵەندیەکان لە زۆر ڕووەوە دەچەوسێنرانەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شتێکی سەیر نەبوو کە هەتا پۆڵەندییە دژە سامیەکانیش هاوکاری جولەکەکانیان دەکرد لە کاتی جەنگدا. ڕەنگە ئەو فریاکەوتن و یارمەتیدانە بەهۆی پاڵپێوەنەری دینی یان ویژدانەوە بوو بێت یان لە ڕقی ئەڵمانیەکان. بێجگە لە جولەکە و قەرەجەکان هیچ دەستە و گرووپێك گەلێك هێندەی پۆڵەندییەکان تاڵاوی لەدەست نازیەکان نەچێشت. هەر بۆیە دوژمنایەتی کردنی نازیەکان ئەوانەی لێك نزیك کردەوە. بەڵام دەشبێت ئەوە بڵێین کە ئەو ٣٠٠,٠٠٠ جولەکەیەی پاش جەنگ ڕزگاریان بوو و لەکۆی ٣ ملیۆن جولەکە تەنها ئەوان گەڕانەوە پۆڵەندا کەچی لەلایەن پۆڵەندیەکانەوە بە ساردی و بە چاوی دوژمنکارانەوە سەیریان دەکرا. جارێکی تریش ڕاوەدوونان و چەوساندنەوەیان دەستی پێ کردەوە. زۆربەی جولەکەکان ڕایان کرد. ئەمڕۆش ژمارەیەکی زۆر گەنجی پۆڵەندی سەرقاڵی گرنگی دانن بە مێژو و ڕابوردوی جولەکەکانی هاوولاتیان لە شوێنی خواپەرستنە چۆڵەکانیان و سەرقەبرانە بەجێماوەکانیان. بەڵام جولەکەکان خۆیان دیارنەماون.

یادی (کامپۆ دێ فۆری)دەکەمەوە
لە وارشۆدا، ئێوارەی ڕۆژێکی بەهاری ڕازاوە
لەسەر ئاوازی مۆسیقایەکی بەجۆش
ئەو ئاوازە بەسۆزە
دەنگی تەقەو هاڕەی نێو گیتۆکە
کە لەپشت دیوارەکانەوە دەهات
لەنێوخۆیدا نقومی دەکات
کوڕوکیژەکان دوو بەدوو
دەفڕن بەرەو ئاسمانی شین

کاتێکیش با بەسەر ئەو ماڵە گڕگرتوانەدا
کۆلارە ڕەشەکان دەفڕێنێ
سواربووەکانیش بەئاسماندا
دەست بە تاڵە دەزووەکانەوە دەگرن
هەمان ئەو هەوا گەرمەیە
دێت و تەنورەی کچان هەڵدەداتەوە
خەڵکەکەش قاقا لێ دەدەن
بۆ ئەو یەك شەممە جوانەی وارشۆ

یەکێك ڕەوشت دەلێتەوەو
دەڵێت خەڵکی ڕۆماو وارشۆ،
بازاڕ دەچن، پێ دەکەنن، خۆشەویستی ئەنجام دەدەن
کاتێك بەلای کلپەی ئەو شەهیدانەدا دەڕۆن.
هێندێکی تر ڕەوشت دەخوێننەوە :
ئەوەی ئینسانیەت بوو نەما
بیرچونەوە لەدایك بوو
پێش ئەوەی گڕەکان نەمێنن

بەڵام ئەو ڕۆژە من تەنها بیرم
لەتەنیایی مەرگ دەکردەوە.

سیسلاف میلۆسز لە (کامپۆ دێ فیۆری)دا..



پۆلی قوتابخانەیەکی پۆڵەندا

سیسیلیا پریزبلوکا. ژنێکی پۆڵەندی بوو، هاوڕێ جولەکەکانی پۆلەکەی خۆی لەیاد ماوە و ئاوا باس لە چارەنوسیان دەکات.

"بەچاویلکەکەی تەماشایەکی ئەو منداڵانەی نێو وێنەکەی کرد. ئەو منداڵانەی خەلکی شاری کۆسۆڤۆن لە پۆدۆلیا، هەموو دلشادن و چونکە هێندەی نەماوە پشوی قوتابخانە دەست پێ بکات.
کە یەکەم جار چوم بۆ قوتابخانە، باوکم پێی وتم دەبێت لەگەل منداڵی جولەکەدا دانیشیت. هەموو جار ئەیوت: جولەکەکان خەلکی زیرەکن - ئەبێت خەلك گوێ لە ئامۆژگاریان بگرێت. ڕەنگە هەر ئەوەش بێت وای لێ کردم زۆر لێیان نزیك ببمەوە. ئەوەی زۆرتر لە دلما شیرین بوو (ڕۆزا و کلارا) بوون، کە هەمیشە لە ناوەڕاستی پۆلەکەدا دادەنیشتن. ڕۆزا زۆر جدی بوو. هەمیشە قژی بەدوو پرچ دەبەست و گولی لەملاولای سەری دەدا. زیرەکترین خوێندکار بوو لە ماتماتیکدا، پێی خۆش بوو یارمەتی ئەوانیتر بدات. لە گەشتەکاندا نانی (کریبس)ی بۆ هەموو خوێندکارەکان دێنا، باوکی فڕنی سەمونی هەبوو.

لەتەنیشت ئەوەوە (کلارا) دادەنیشت، هەمیشە پێکەوە بوون، پرچی لول و کورت بوو، هەمیشە بە تەعلیقەکانی منداڵەکانی دەخستە پێکەنین. لە پۆلەکەدا (کلارا)یەکی تریش هەبوو زۆر بێ دەنگ و زۆریش هەوڵی دەدا، کیژێکی جوان بوو. لە وێنەکەدا لەتەنیشت دیوارەکەوە ڕاوەستاوە. لەپشت ئەوەوە (مۆشی)یە کە یەخەی کراسە سپییەکەی هاتونەتە خوارەوە، مۆشی هەمیشە ئەو جۆرە کراسەی لەبەر ئەکرد و هەمیشەش سەری لەسەر هەردوو مەچەکی دادەنا و بیری دەکردەوە، مامۆستا پێی دەگوت: مۆشی، من دڵنیام تۆ وەڵامەکە دەزانیت. لە ڕاستیشدا وابوو. سۆنیا لەدواوە و لەلای چەپ دانیشتوە، منداڵێکی تەنیا بوو، زۆر ڕێکوپێك بوو گەلێکیش جوان بوو و بەردەوام بە سەماکردنەوە بەرەو پۆل دەڕۆیشت. هەروەها سارا (لێرەدەدا لەلای ڕاستەوەیە) قژێکی سوری (ڕەنگ مسی) هەیە، زۆر شەرمن بوو، زمانی پۆلەندی باش نەدەزانی. کچ و کوڕێکی تریش هەبوون بەڵام ناویانم لەیاد نەماوە (. .) کە ئەلمانیەکان هاتن، منداڵەکانی ناو ئەم وێنەیە و هی هەموو خوێندنگاکە و دایك و باوکیان و هەموو کەسوکاریان کوژران. هەموویان بردنە دەرەوەی شار بۆ (کانە بەردەکان) هەمویان ڕەمی کردن. بەو شێوەیەش یەك لەسەر سێی شارەکەمان کوژران. لە جولەکەکان چوار کەس ڕزگاریان بوو، باوك و کوڕێك چونە هۆڕەکانی (زۆنگاوەکان)ی دوور لە شار، هەروەها دایکم (سزموك و دەزگیرانەکەی) شاردەوە. هەردوکیانی خستە ژێر زەمینەکەوە و بۆ ماوەی ساڵ و نیو خواردنی دانێ و خزمەتی کردن، هەتا ئەو کارەی لە باوکیشم شاردەوە و بەو شێوەیە لەژێرزەمینەکەدا ژیان و لەو تراژیدیایە ڕزگاریان بوو، منداڵێکیشیان بوو بەڵام بەمردوویی لەدایك بوو و هەر لەتەنیشت خۆیانەوە ناشتیان و ئەو مەسەلەیان پاش ئازادبوونیان لای ئێمە درکاند.

## دیموکراتیەکان دەرگاکانیان دادەخەن

ئەو ڕاونان و کومەلکوژیەی ئەلمانیا دژی جولەکەکان ئەنجامی دەدات لای زۆر کەس لە خەلکی ولاتە دیموکراتیەکان نەزانراو بوو یان ڕوون نەبوو(٣). بیری دژە سامی گەلێك بلاو بوو و بەلام دیارە ئەو بیروڕایەش لەگەل بیری مرۆڤایەتی و یەکسانی و دیموکراتیەت و ڕەوشتەکانی کۆمەل یەکیان نەدەگرتەوە. هێندێك کەس ویستیان هاوکاری جولەکەکانی ئەوروپا بکەن، بەلام زۆرینەی خەلك چاو نوقاو و دەرگای ڕزگاربونی ئەو خەلکە کلۆم کرابوو. ژمارەیەکی کەم لە سیاسەتمەداران بەئاشکرا دژایەتی ڕاگواستنی ئەو خەلکەیان کرد. دەنگی نارەزایی بەرز دەکرایەوە بەلام کاری ڕاستەوخۆ و پێویست بۆ یارمەتی دانیان گەلێك کەم بوون. حکومەتی سوید بەهەمان شێوەی دیموکراتیە ڕۆژئاواییەکانی تر ڕەفتاری دەکرد. لە شوباتی ١٩٣٩دا، سگفرید هانسۆنی سەرۆکی تەندروستی و کاروباری کۆمەلایەتی دانی بەوەدا نا کە "ناتوانین سنگ دەرپەڕێنین و بلێین ئەوەی پێویست بوو بۆ هاوکاری ئەو ئاوارانە کردمان و باوەشمان بۆ کردنەوە. زۆریش دەست بلاو نەبووین لەبەخشینی ڤیزە و ئیقامە بەو کەسانەی بۆ دەرباز بوون لەو دۆزەخە داوای ڤیزەیان دەکرد"

لە پایزی ١٩٤٢دا هەوالی ئەو کۆمەلکوژیە بەرفراوانە گەیشتە هەموو لایەك و فشاری ڕای گشتی لەسەر دەولەتە هاوپەیمانەکان زیادی کرد تا کارێك بکەن. کاتێك سالی ١٩٤٤ ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکاو لەسەردەمی سەرۆك ڕۆزفلتدا (لیژنەی هاوکاری ئاوارەکانی جەنگ War Refugee Board)ی پێك هێنا کە ئەرکی سەرەکی ڕزگارکردنی جولەکەکان بوو. حکومەتی بەریتانیا ناوی نابوو گەمەی پروپاگەندە.

لەگەل ئەوەشدا کە WRB لە چەند ڕویەکەوە چالاك بوو بەلام زۆربەی مێژوونوسەکان کاردانەوەی ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا دەربارەی قەتل و عامی جولەکە بە یەکێك لە خراپترین فەشەلی سەرکردایەتی ڕۆزفلت لە قەلەم دەدەن. لەلایەکی ترەوە ئەوانەی بەرگری لەو سیاسەتەی دەولەتانی هاوپەیمان دەکەن و دەلێن باشترین ڕێگا بۆ ڕزگارکردنی ئەو جولەکانەی ئەوروپا ئەوە بوە بجەنگێن لە پێناو کۆتایی هێنانی جەنگ بە خێرایی. بەلام زۆربەی ئاگاداران ئەیانەوێت ڕەخنە لەوە بگرن کە لە مەسەلەی قەتل و عامەکەدا دیموکراتیەت فەشەلی هێنا.



### شوێنێك نیە بۆی بچن

جولەکە ئاوارەکان لەسەر پاپۆڕی ئێس. ئێس. سانت لویس پاش ئەوەی ناچار کران بگەڕێنەوە بۆ ئەوروپا. لە١٣ای مایسی ١٩٣٩دا نزیکەی ١٠٠٠ جولەکە شاری هامبۆرگ یان بەجێ هێشت و سواری پاپۆڕی ئێس. ئێس. سانت لویس بوون تا لە چنگ نازیەکانی ئەڵمانیا دەربازبن. بەنیازبوون بەرەو کوبا بڕۆن و بەڵام کوبا نەیهێشت بچنە ناوخاکەکەیەوە، هەوڵی پەناهەندەیی لە ئەمەریکاش سەری نەگرت. هەر بۆیە پاش مانگێك لەوەی ئەوروپایان بەجێ هێشت لە ١٧ای حوزەیراندا گەڕانەوە لەسەر لێواری (ئەنتوێرپ) لە بەلجیکا پاپۆڕەکە ڕاوەستا. هیچ کام لە وڵاتانی دەرەوەی ئەوروپا دەرگای بۆ نەکردنەوە. ئەگەرچی هێندێکیان شوێنێکی لە ئینگلترا دەست کەوت و بەڵام زۆربەیان کەوتنەوە بەردەستی ئەڵمانیەکان و بەرەو مەرگ ڕاپێچ کران.

"دەستمان لە ئیش کردن هەڵگرت، سەربازە ئەڵمانیەکان و خەڵکەکە بەرەو ژێر زەمینەکان ڕایان کرد، بەڵام زۆربەی ئێمە لە شوێنی خۆمان نەجولاین. ڕەنگە ئێمە بەو کارەمان ویستبێتمان دەری بخەین کە ئێمە ئازاترین، یان وەك جۆرێك لە تۆڵەسەندن سەیرمان کردبێت. ئێمە هیچمان نەبوو تا بترسین لە کیسمان ئەچێت، زۆر کەیفمان بەوە دەهات کە ئەو کارگە گەورەیەی ئێمە بۆ کۆمپانیای پیشەسازی I.G فارین دروستمان دەکرد خاپور ببێت، تەنها هەر ئەوەندە بوو.

ئەو هەست بەخۆشی کردنە، لە کاتی بۆردومانی ئەمریکیەکانیشدا بەردەوام بوو، ئەگەر چی هێندێك جار خۆشمان دەبوینە قوربانی ئەو بۆردومانانە و دەکوژراین و بریندار دەبوین. بەڵام چەند شتێکی دڵخۆشکەر بوو کە دەمانبینی پۆل پۆل لە فڕۆکە ئەمەریکیەکان لە ئاسمانەوە بۆمبارانیان دەکرد، بیناکانیان دەڕوخاند، هەروەها لەو خەڵکە خۆسەپێنەر و زاڵمانەیان دەکوشت.

ئەو بۆمبارانە هەست و بیری بزواندین و ئەگەر و هیوای دەرباز بوونمان لەو دۆزەخەی تێیداین زیاد دەبوو. هێندێك جار گێل بوین و پێمان وابوو پەیوەندیەك هەیە لە نێوان ئەو بۆمبارانەی هاوپەیمانەکان لەگەڵ ئەو ڕێکخراوە نهێنییە بچکۆلەیەی لە ئۆردوگاکەماندا کاری دەکرد، کە من خۆم یەکێك بووم لەوانەی پەیوەندیم پێیانەوە هەبوو. ئێمە بە خەیاڵ پەیوەندیمان لەنێوان ئەو بۆمباران و کاولکاریە و دەربازبونی خۆماندا دەدۆزیەوە، ئەو کاولکاریەی لە ئاسمانەوە بە بۆمبا و لەسەر زەویش بەدەستی ئێمە کە لەکاتی هەڵاتنماندا ئەنجامی دەدەین، هەتا ئەگەر خۆمان ببین بەبۆمبی زیندوو - بکوژرێین.

بەداخەوە هیچ کام لەوانە هەرگیز نەهاتە دی"

شالۆم لیندەباوم

یەکێك لەوانەی لە ئاوشوێز مۆنۆوتز - ڕزگاری بوە.

## بۆمباران کردنی ئاوشویز

لە مایسەوە تا تەموزی ١٩٤٤ بە بەرچاوی هەموو دنیاوە ئەڵمانیا سەدان هەزار جولەکەی هەنگاری دەستگیر دەکرد و بەناو سلۆڤاکیادا بەرەو ئۆردوگای مەرگ لە ئاوشویز-بیرکناو ڕاپێچی دەکردن. زۆر کەس و لایەن کەوتنە پاڕانەوە لە دەوڵەتانی هاوپەیمان تا هیممەتێك بکرێت بۆ ڕاگرتنی ئەو کومەڵکوژییە.

بیرۆکەی بۆمباران کردنی - ئۆردوگای بیرکناو- ئەو ئۆردوگایەی کە هەموو کەس دەیزانی چی تیایدا ئەنجام دەدرێت. بۆردومانی هێڵی شەمەندەفەری ئۆردوگاکە، ئەوانە داواکاری هەموومان بوو.

جەنگ لە دوا ساڵیدا بوو، هێزی ئاسمانی هاوپەیمانەکان لە ئاسمانی ئەورووپادا باڵادەست بوو. فڕۆکە بۆمبهاوێژە ئەمەریکیەکان لە ئیتاڵیاوە هەڵدەستان و هەموو ڕۆژێك بەسەر ئۆردوگاکەدا دەفڕین، بەڵام لەبەر چەند هۆیەك بەرپرسە ئەمەریکی و ئینگلیزەکان نەیاندەویست ئۆردوگاکە بۆردومان بکرێت. هێندێك لەو بەرپرسانە بیانوی پڕوپوچیان دێنایەوە. پاش دوو مانگ دوای ئەو داواکاریە (ڕیچارد لۆ)ی وەزیری بەریتانیا وەڵامی داواکاریەکەی (چاییم ویزمان)ی سەرکردەی جولەکەکانی دایەوە نوسیویەتی "ئەو کارە لەلایەن سەرکرایەتی هێزی ئاسمانییەوە تاووتوێ کراوە، بەڵام بەداخەوە دەبێت بڵێم و کە بەهۆی هێندێك هۆی تەکنیکی گرنگەوە کە هاتونەتە پێش و لەکاتی ئێستادا ئەو داوایەمان پێ جێبەجێ ناکرێت. من پێم وایە ئەم بڕیارە ئێوە توشی بێ بڕوایی دەکات، بەڵام دەمەوێت دڵنیاتان بکەم کە ئەو مەسەلەیە زۆر بەجدی خراوەتە بەر باس و لێکۆڵینەوە" . . هێندێك لە مێژوونوسان لەو بارەیەوە بۆچونی جیاوازیان هەیە. هۆیەکانی ئەنجام نەدانی ئەو بۆمبارانە هەتا ئەمڕۆش ڕوونە نیە. بەڵام ڕاستیەکی حاشا هەڵنەگر هەیە ئەویش ئەوەیە کە هیچ کارێکی جدی نەکرا بۆ یارمەتیدانی ئەو جولەکانەی بەهەزارەها دەبران بۆ ژوورەکانی گاز.

## قەتڵ و عام – دەرس و پەندە بۆ گوتنەوە ؟

نوسەری فەرەنسی خاتوو چارلۆت دێلبۆ، خۆی یەکێکە لەوانەی لە ئۆردوگای ئاوشویز وەك بەندێکی سیاسی لەوێ گیراوە و لە نوسینەکانیدا وەسفی ئەو جیهانە بێ بن و بێ کۆتاییەی ئۆردوگاکانی نازیەکان دەکات. داوامان لێ دەکات کە چاو نەتروکێنین لە تەماشای ئەو جیهانەی ئۆردوگاکان و تابتوانین لێی تێ بگەین. ئەگەر چی خۆشی دڵنیایە کە ئەو زانیاریانەی خۆی پێشکەشی کردوون هێشتا زۆر کەمن!!

ئەوە شەیتانە کە نایەڵێت لە قەتڵ وعام تێ بگەین و هەوڵ بدەین دەرس و پەند لە ڕابوردوو وەرگرین. هەتا ئێستاش ئەو کاولکاریەی لەجەنگی دوهەمدا ڕویاندا لە لای زۆر کەس ڕوون نیە و لێی تێ ناگات.

ئێمە دەزانین کە دوو هۆکار هەبوون بۆ ئەو هەڵایسانی ئەو جەنگە لە ئەوروپادا.

یەکەمیان شەڕی دەسەڵات و هێز بوو کە لەو بەینەدا و بۆ ئەو مەبەستە ملیۆنەها کەس گیانیان لەدەستدا. ئەوەی دووهەم ئەگەر چی جیاوازە – بەڵام تازەیە. جەنگێکی ئایدیۆلۆژی بوو مەبەستی سەرەکیشی لەناوبردنی تەواوی جولەکەکانی ئەوروپا بوو بە شێوەیەکی بایۆلۆژی و لەناوبردنی داهاتویان بوو. هیتلەر جەنگی دەسەڵاتی دۆڕاند، بەڵام زۆر کەس پێیان وایە کە جەنگی دووهەمی بردەوە و هیتلەر خۆی شکی هەیە لەوەی کە گەلی جولەکە، ئەو گەلەی زۆری بەسەر مێژوی ئەوروپاوە هەیە، پاشە ڕۆژێکی هەبێت لە داهاتودا. ئەگەر ئەم بۆچونە ڕاست بێت یان هەڵە هەر دەبێت چاوی لێ نەپۆشرێت، بەڵام ئێمە دەتوانین دڵنیابین کە پێشکەوتنی ئەوروپا بۆ هەتا هەتایە زەرەرمەند بوو. ئەوەش ئاکامێکی باش نیە.

ئێمە زۆر دەربارەی جینۆسایدی جولەکە دەزانین. "چۆن؟" تا ئێستاش یەکێکە لە پرسیارە هەرە گرنگەکان بۆ ئەوانەی مەبەستیانە بزانن.. بەڵام "بۆچی ؟" بۆ نمونە بۆچی ٩٠٪ ی منداڵانی جولەکە لە سالی ١٩٣٩دا "ئەبێت" بمرن، ئەو مەسەلەیە ئەمڕۆ گرنگە هەر وەك چۆن کاتی خۆی بۆ ئەو قوربانیانە گرنگ بوو. هێندێك پێیان وایە کە تێگەیشتنی تەواو لە قەتل و عام لەوە بەدەرە مرۆڤ بتوانێت تێی بگات. زۆر کەم ئەگەر هەموو ڕوداوەکانی مێژوو بەو شێوەیە تەماشا بکرێت.

مانەوەی ئەو تێ نەگەیشتنە و هەوڵنەدان بۆ زانینی و ئەو قەتڵ و عامە "بۆچی"؟ مەترسییەکی گەورەیە لەسەر داهاتوومان. نەك لەبەر ئەوەی ئەوە مەسەلەیەکە پەیوەندی بەجولەکەوە هەیە.

(بریمۆ لیڤی) نوسەر دەڵێت: نە ئاسانە و نە کارێکی پەسەندیشە، هێندە ئەو ڕابووردوە تاڵە تاوتوێ بکەین و لاپەڕەکانی هەڵدەینەوە. (..) یەکێك بیەوێت ڕوو وەرگێڕێت و گوێچکەو مێشکیشی قفڵ کات! ئەمە کارێکە مرۆڤ دەبێت بەرەنگاری ببێتەوە. "ئێمە ئاواتەخواز بووین کە قەتڵ و عام هەرگیز ڕوی نەدایە. بەڵام، ڕوویدا و لەناو جەرگەی ئەوروپادا ڕویداو بۆ هەتا هەتایە بەشێکە لە میراتی ئەوروپا.

هۆمەر بارتۆڤی مێژوونوس پێی وایە ترسناکترین شت ئەوەیە "وابزانین دەرس و پەند وەرگرتن لە قەتڵ و عام و دەرخستنی هەموو ڕاستیەکانی کارێکە مەحاڵە" ئەو پێی وایە هەموو ئەو پرسیارانەی دێنە پێشەوە بێ مانا دەبن ئەگەر "تەنها تەماشای ڕوداوەکان بکەین دوور لە ماناکانی... هەموو لایەنەکانی هەموو کون و قوژبنێك.. تا وامان لێ دێت لەبەر بیرکردنەوە و چوونەخوارەوە بە ناخی ئەو کارەساتەدا هەناسەمان سوار بێت و هێزی خەیاڵ و بیرکردنەوەمان بوروژێ"

ئەمە بۆچونێکی بەهێزە. قەتڵ و عام خاڵێکی ڕەشە لە مێژوی ئەوروپادا[*] و لە مێژووی هەموو دنیای نوێدا.

پێویستە تێبگەین کە کەسانێك بوون وەك من و تۆ کە بڕیاریاندا ئەو کارەساتە ڕوو بدات. خۆیان ئەو کۆمەڵکوژیەیان هەڵبژارد و پیلانیان بۆ دارشت و بۆ ماوەی چەند ساڵێکی لەسەر جێبەجێ کردنی بەردەوام بوون. دەیانتوانی شتێکی تر هەڵبژێرن. کە دەبوایە هەڵیبژێرن.

هەر بۆیە، ئەوە ئەرکی سەرشانی هەموو دایك و باوکێکە تا منداڵەکانیان گوش بکەن و سیاسەتمەداران و کاملەکان منداڵانمان فێر بکەن. ئەوانیش منداڵەکانیان فێر بکەن، کە باشترین هەڵبژاردن و ڕاسترین هەڵبژاردن هەیە بە هەمان شێوە هی چەوتیش هەیە، بەڵام شتە باشەکە هەڵدەبژێردرێت کاتێك بزانین خراپەکە بە چ ئاکامێکمان دەگەیێنێت.

ئەم تاوانانە بێ وێنەن، یەکەم لەبەر ئەو ژمارە زۆرەی قوربانیەکان. هەروەها پتر ترسناك و بێ وێنەن لەبەر ئەو ژمارە زۆرەی کە یەکیان گرتبوو بۆ ئەنجامدانی (..) کە پێشبڕکێ یان دەکرد لەسەر دڕندەیی ئەنجامدانی ئەو تاوانە.[٤١]

رۆبێرت.ئێچ. جاکسۆن
سەرۆکی حاکمە ئەمەریکاییەکان لە دادگایی کردنەکانی نۆرمبێرگدا

ئاە ئەزانیت
ئەزانیت كە برسێتی بریقەی چاو زیاد دەكات
توینێتی تاریكیان دەكات
ئاە ئەزانیت
ئەزانیت، دەتوانیت مەرگی دایكت ببینیت
یەك دڵۆپ فرمێسكی بۆ نەڕێژیت
ئاە دەزانیت
دەزانیت كە لەبەیانیان دا مەرگ بەئاوات دەخوازیت و
ئێوارانیش لێی دەترسیت
ئاە دەزانیت
دەزانیت ڕۆژێك لە ساڵێك درێژترە
دەقیقەیەك لە هەموو تەمەن درێژترە
ئاە دەزانیت
دەزانیت قاچ لە چاو ناسكترە
دەمار لە ئێسك توندترە
دڵیش لە پۆڵا ڕەقترە
(..)
ئەزانیت كە ئازار بێ كۆتاییە
كە تۆقاندن بێ سنورە
تۆ ئەوە دەزانیت
تۆ كە دەزانیت.

چارلۆت دێلبۆ

